لەچاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری ی و لاوان




# بزەی سروشت

شیعر

پیربال محمود

لەچاپکراوەکانی ئەمیندارێتی گشتی
ڕۆشنبیریی و لاوان

# بزەی سروشت

## شیعر

پیربال محمود



برایان : هەڵگرن وێنەم لە لاتان ،
بە یادمکەن لەگەڵ ئێوە ژیاوم
لەگەڵ ڕەنگی گەڵاتان ڕۆیی ڕەنگم ،
بە بێژنگی بەڵاتان بێژراوم
لەگەڵ ئێوە لەباخان هاتوچۆم کرد ،
لەگەڵ ئێوە بە شاخان هەڵگەڕاوم

# پێشکەش

پێشکەشە بەو کەوەك پەری
ناسك بوو، وەك شۆخەزەری
پێشکەشە بەو گوڵەی کەوا
بە نائومێدی هەڵوەری
پێشکەشە بەو ئەستێرەیەی
لەئاسۆی ژینم تێپەڕی
لەپڕ ئاوابوو، وونبوو لێم
تروسکەی چاوی گەوهەری
لەدوای خۆی بۆ چەرمەسەری
جێی هێشتم بۆ دەربەدەری
دیدە قەشەنگی ئەونەمام،[1]
گۆنا پەڕەنگی، پووپەری
دونیا نەدیتەی خێر نەدیو،
لەشادمانی بێبەری
پێشکەش بە ئەو بێ زایەڵەم،
چریکەم، کێش و لەنگەری[2]
چلۆن لەبیر ئەکەم چلۆن
بزەی نیان و دلبەری ؟
نەخش و نیگاری دیمەنی،
بریقەی ڕەنگی شەستەپەڕی
ئەگریجەو پەرچەمو قژی،
ئاوریشمی تاجەکەی سەری
گەردانەی گەردنی گەشی،
پلپلەی سوخمەکەی بەری

بازبەندی بازووی ئەسمەری ،
هەیاسەی قەدو کەمبەری
نازو توانجو گەنجەفەی ،
گاڵتەی بەتامو شەککەری
وەستانی لەبەرامبەرم ،
وەستانەم لەبەرامبەری
سوتانی لەدەوروبەرم ،
سووتانم لەدەوروبەری
مەکەن لۆمەم مەکەن ، مەکەن
لەسەر شەپۆڕو چەمبەری
بەهەشتی خەونم بوو ، منیش
بەهەشتی خەونی بێزەری
بێجگە لە تاسەی حەزی من
چی نەدی گیانو جگەری
بۆم ببوو بە مژدەدەرم ،
بۆی ببووم بە مژدەدەری
تا هەم ئەژی لەنێو دلم ،
ئەمێنێ وێنەی پەیکەری
سێبەری سایەدارم بوو
کوانێ ؟ لەکوێ ما سێبەری ؟
خوای میهرەبان بوو دانەری ،
بۆ خۆی بردەوە دانەری
ئەیان ووت : زۆر بەختەوەرم
کوا ؟ لە کوێ ما بەختەوەری ؟ !
شەککەرم چاندو خوێم ڕنی
خوێ چ خوێ ؟ خوێی دەردەسەری !
ئەمڕۆ نە بەی ، نە مەی لەلام

ماوون ، نە نەی هونەروەری
لەگەڵ بەهاری تەمەنم
ڕۆیین ، لەگەڵ زەردەپەڕی

* * *

(١) پەڕەنگ : بەڕای قەڵەو : پەنگر ، پشکۆ .
(٢) کێشولەنگەر : وەزن و قافیە .

# سەرنج و وێنە

سەرنجی هەستی مەستم دا بە چاوم
بەرەو ئاسۆی ژیانی تێک شکاوم
نەبوو ئەستێرەیێ تاکو ترووسکەی
بگاتە ناو شەوی گیان و هەناوم
ئەگەر سەیری دوو چاوم کەی ئەبینی
لەئێش و خەم چەقاون هەردوو چاوم
دریغی من نەبوو ڕووداوی گەردوون
ڕماندی پەیکەری تاسەی بەتاوم
ئەگینا بولبولێکی نەغمەخوان بووم
لەنێرگزجاڕی خاکی خۆش کراوم
هەزار خرپەم ئەخستە گوێی نیساران ،
هەزار چرپەم ئەخستە گوێی شەتاوم
هەزار بەندم ئەدا گوێندە بێژان
لە دەنگی دەن لەئاهەنگان بە ناوم
هەزار نۆتەو هەزار سمفۆنی نایاب ،
هەزارو یەك ژەنەی هەڵواسراوم
خولی چۆپی بە پێکی دووزەلەی من
ئەهاتە جۆش لەسەر شانۆی ڕماوم
برایان : هەڵگرن وێنەم لە لاتان ،
بە یادم کەن لەگەڵ ئێوە ژیاوم
لەگەڵ ڕەنگی گەلاتان ڕۆیی ڕەنگم ،
بە بێژنگی بەلاتان بێژراوم
لەگەڵ ئێوە لەباخان هات و چۆم کرد ،

لەگـەل ئێـوە بـە شـاخـان هـەلگـەڕاوم
لەگـەڵ ئێـوە لەئـاست پـۆڵی چـوانـان
لەگـەڵ لافـو گـەزاف خـۆم دوواوم
لەنـاو ڕەنگی چـریکـەم ڕەنگی داران ..
دیـارە ، ڕەنـگـی بـێـسـتـان و بـەراوم
قەڵبەزەو بـەفری لوتکـەی بەرزو بـاڵام ،
پـەپـولەو هـەنـگو ئـاسکی ڕاکشـاوم
لە داران و لەگـوڵزاران بـپـرسـن
ئـەوان پێتـان ئـەڵێن چـۆنـە خـونـاوم ؟
بـەهـەشتم نیشتمـانـە ، خـۆشـەویستم
کـەلە ، ئـێـوەن لەژیـنـا دایـك و بـاوم
دڵێـکـم بـوو لەتـێـکـم دا بـە ئـێـوە ،
لەتـێـکـم دا بـە یـاری شـۆخ و لاوم
لەتێ گڵپـە ، لەتـێ پـرشنـگی شـادی ،
لەتێ شـۆرش ، لەتێ تـاسـەی هـەلاوم
ئـەگـەر مـردم لە گـۆڕسـتـانی شـارم
لە گـۆڕم نـێن ، لەتـەك یـاری نـەمـاوم
ئـەمن (مەم) بـووم لە بـاخی ئـاڵ و والای
ئـەویش (زین) بوو لە بـاخی بەر هـەتاوم
ئەمن (فەرهاد) ی کێوی نیشتمـان بووم ،
ئـەویش (شیـرین)ی گیـانی پـڕ گـولاوم
لەسـەر دوو کێـلی گڵکـۆم وا بـنـووسن
یـادم بـکـەن دوای ژیـنـی تـەواوم
شـەهیـدێکم لەگـەڵ خـوێنی شـەهیـدان
بـە خـاکی پـاکی ئـێـوە هـەڵسـواوم

* * *

هەولێر : ١٩٧٠

# پێناسی شاعیر

خۆ مەلی یانەی چریکەداران
بزانێ منیش وەکو باڵداران
گۆرانی ئەڵێم بۆ عیشوەداران
لێرە ، لەباخی پۆلی دڵداران
خۆی ئەخاتە بەر سۆڵی ئەوو ئەم
تا پێی ببەخشم زەنگی زایەڵەم !



خۆ مانگی ڕووناك كاتی نیوەشەو
بزانێ منیش وەك تریفەی ئەو
ئەدرەوشێمەوە ، لەسەر عەرشی نەو
بۆ پەریزادەی خەونی خۆشەخەو
ئەكوژێتەوە لەوێدا ئەو دەم
نقوم ئەبێتە ناو دەریاچەی بەتەم !



خۆ گوڵی بۆندار لەئینجانەی شەنگ
بزانێ منیش وەك ئەووم بە ڕەنگ
هەیتم بۆ ، هەیتم دیمەنی قەشەنگ
گەشتر لەتیشكی خەرمانەو گەزەنگ
ئەوەرێ وەكو گەڵای زەردی چەم
ئەتاوێتەوە لە دۆزەخی خەم !



خۆ هەنگی شەنگی ترۆپکی چیام ...
بــزانــێ منــیش وەك ئــەو دڵنیــام
پــەرۆشی قەنــدو تەنــدی نێــو گیــام
خۆی ئەخــاتە بــەر پیلاوی سیــام[1]

تا پێشکەشی کەم خۆشاوی بەهــرەم
قــومی یەکــەم و دووەمو سێیــەم !

خۆ پەپولەی ناو مێـرگی گوڵ گـوڵم
بــزانــێ منــیش بــە هــەمــوو دڵم
کەرنۆش ئەبم بۆ خونچەی سەرچڵم
دێ هــەڵدەنیشێ لەلای ســونبــوڵم

ســەرنج ئــەداتــە پــریشکی دیــدەم
تا پیرۆزی کەم بە گڕی خەنــدەم !



خــۆ وێنــەکێشی پــەیکــەرو کــاڵام
بــزانــێ مــنــیش بــە ئــاڵو واڵام
بــەهەستو نــەستو ڕازو سکــاڵام
ئــەکێشم وێنــەی ســروشتی بــاڵام

چیتر ڕیشەکــەی بەرامبــەر ڕیشەم
بەکار نــاهێنێ لەبەر ئــەندێشــەم !

ئەی خوێنەوەران : ژێی تاران منم
دەردەنگی زەنگی قــەتــاران منم[2]
ســازی سەر شــانۆی نیگــاران منم
پێشــەنــگی تــیپــی هــوزاران منــم

منم بــۆ جیهان بــەرامەو بــەرهەم ،
دڵ نادەم بەزۆر ، زۆر نادەم بەکەم

زاخو : ١٩٥٦

(١) سیا : ڕەش
(٢) دەردەنگ : صدی .

# کوانێ تەمەنم ؟

کوانێ تەمەنم ؟ من بێتەمەنم
نابینی تاکو ئێستا ڕەبەنم ؟
نابینی ناوی چیمەنم چکە ؟
کوانێ لەکوێ ما ناوی چیمەنم ؟
نابینی زەردەخەنەی جوانیم
کوژاوەتەوە لەسەر دەمەنم ؟
نابینی ووزەی کاتی لاویەتیم
نەماوە لەنێو گیان و بەدەنم ؟
نابینی داوی سپی و ڕەش بەڵەك
پێی ناوەتە سەر مل و گەردەنم[1] ؟
بەهارم ڕۆیی بە نائومێدی
نە گوڵاڵەم ما ، نە یاسەمەنم
خەزان سەری خۆی هەڵدا لە ئاستم ،
هێرشی بردە باخی ڕۆشەنم
سەیری هەر لام کەی گەلاڕێزانە
لە دارستانی ژین و تەمەنم
هەر گەردەلوولە خول ئەخواتەوە
لەکۆڕەپانی ڕەزو گوڵشەنم
هەر ڕەهێڵەو هەر باوو گەرداوە
گەشکە ئەگرنە ژینی شکەنم
نییە قوژبنێ خۆمی تێکوتم ،
نییە کەلەنێ بێتە کەلەنم
نە دەنگم دەنگە وەك جاری جاران ،
نە زەنگم ، زەنگە ، نە نەی دەگمەنم

نە خورم خورە ، نە مانگی پڕم ،
نە کوڕم کوڕە ، نە ئەنجومەنم
نە چۆپیم چۆپی ، نە سەمام سەما ،
نە زورنام زورنا ، نە زورناژەنم
دوێنێ لەوێنەی ئاسۆی بەهەشت بووم ،
ئەمڕۆ لە وێنەی ئاسۆی کوڵخەنم
دوێنێ لەگەڵ (بۆ) لەچەنەچەن بووم ،
ئەمڕۆ لەگەڵ (سۆ) لە چەنەچەنم
دوێنێ تاری خۆم بێخەم ئەژەنی ،
ئەمڕۆ تاری خۆم بە خەم ئەژەنم
دوێنێکە هاوڕێی دەف و دەفزەن بووم ،
ئەمڕۆکە بەبێ دەفو دەفزەنم
کوا بەختەوەری سەرەتای گەنجیم ؟
کوا زەردەپەڕی خۆری بەندەنم ؟
(خەمم شەنێ بوو لێم بوو بە دوو شەن)[1]
بۆ کوێ بەبادەم خەمی شەنشەنم ؟
لەگەنم دانا بۆ ئاوی باران !
نە باران باری ، نە ما لەگەنم
بەنمدا چۆڵا بۆ کری هیوا ،
نە هیوام بینی ، نە کرو بەنم
ئەی ئەوەی سەیری دیمەنم ئەکا
حەسرەت ئەکێشێ لەئاست دیمەنم
بپرسە لەوەی کە گوڵ وەرێنە
بۆ کوێ وەراندی گوڵی ئەڵوەنم ؟
چ سوودێکی سەند لەوەراندنی ،
چ سوودێکی دا گەڵو ڕەسەنم ؟ !
هێندە پەرۆشی چەقڵی دەوەن بوو

ده پـیـرۆزی بـێ چـقـڵی دەوەنـم
هـەر گـوڵاڵەیـێ خـوێـنـی لاوێـکـە
مـەیـووە لەنـێـو مـێـرگـی وەتـەنـم !

هەولێر : ۱۹۷۲

---

(۱) ئەم دێرە شیعرە لەشیعرێکی مەولەوی نەمر وەرگیراوە .

# بۆ بووکی وون بوو

ئەی ڕەنگی شەنگی شەنگەداری من ،
ئەی دەنگی زەنگی ئاهەنگداری من
من داهێنرابووم بۆ دیداری تۆ ،
تۆش داهێنرابووی بۆ دیداری من
کاتێ کە وون بووی لە گوڵشەندارم ،
شەوی لێداهات گوڵشەنداری من
ئیتر دڵی خۆم دی لە تاریکی ،
تاریکە دڵی خڕپەداری من
نە ئەستێرەیێ ، نە تریفەیێ
نییە لە ئاخی بریندداری من
بێ ، بگەڕێوە ، بە گەڕانەوەت
ئەڕازێتەوە سایەداری من
مێوەی درەوشاو ئەبێتە چرا ،
دارمێوە ژووری پڕشنگداری من
بێ ، ڕۆشەنم کە وەك جاری جاران ،
هەر تۆیی ، خۆری ڕۆشەنداری من
هەر تیشکی تۆیە ئەدرەوشێتەوە
لەهەستی مەستی چڕپەداری من
ڕاپێچم ئەکا بەرەو ڕووناکی ،
بەرەو ئاسۆکەی ڕەونەقداری من
هەر تۆیی ، تۆیی بووکی لاوێتیم ،
هەر تۆیی ، تۆیی عیشوەداری من
هەر تۆیی زەری شیعرو ئەندێشەم ،
هەر تۆیی پەری گزنگداری من

پەپولەی زاڕۆ بە دەیدەنی تو
دێتە بەزمگەی مژدەداری من
ئەسوڕێتەوە لەسەر پشتی ، (با)
لەماوەی باخی بەهاداری من
وەك گوڵئەستێرەی شەوی شەوگاران ،
وەك بزەی دەمی شەبەقداری من
بۆ زەماوەندو ئەگلەنجەی تۆیە
شریقەی پەنجەی بەهرەداری من
بۆ تۆیە ، بۆ تو زایەڵەی بالای
چریکەی مەلی نەشئەداری من
شەققەی شاپەڕی ئەگاتە شاران
نی‌یە گوێ گرێ لە باڵداری من
تی‌بگاڕازی مرازی زیبای ،
ناخی پڕ ئاخی گڵپەداری من
هەر شوێنێ ئێستا لێرە نەخشاوە
بە دڵداری تۆو بە دڵداری من
لوتکەی بڵندو دارستانی چڕ ،
ئەشکەوت‌و زوورگی گەوەداری من[1]
بەلارو لەبخەت ، بە لەپو پەنجەت
ڕواندراوە ئەسپینداری من
لەهێمنی تۆ هێمنی ستاند
سێبەری شاخی ناوبانگداری من
لەنێو پێلوی تۆ دیدەی چنیوە
ئاسکۆڵەی باخی لەنجەداری من
نەوجوانانی دونیای جوانان
لێرە دیارن لە کرداری من
لە ووردەکاری‌و جوانکاری من ،

له بڕگەی شیعری شەپۆلداری من
ئەی پەریزادەی خاکی دڵپاکان ،
ئەی زەریزادەی پایەداری من
تاشیان بۆ تۆ پەیکەرێکی وا
لە زێڕو زیوی مایەداری من
هەتاکو ماوم ئەمەکداری تۆم ،
چونکە هەر تۆ بووی ئەمەکداری من

پێنجوین : ١٩٥٧

---

# چەپکە گوڵ

## بۆ یار

خێرا ئەی چەپکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ
بڕۆ بەر دەمی یاری شۆخ و شەنگ
بڕۆ بۆ کۆشکو بانێژەی بەرزی ،
ژووری ڕازاوەی بە تەرزاو تەرزی
دابەزە لەنێو گوڵدانی گەشی ،
بەرامبەر بڕۆو برژانگی ڕەشی
تاسەم دەربڕە بەرامبەر تاسەی ،
هەناسەم تێکەڵ بکە هەناسەی
بپرسە : چۆنە حاڵی ، هەواڵی ؟
چۆن ڕائەبوێری کاتی بەتاڵی ؟
چۆنە ؟ چۆن ئەژی لەگەڵ دڵسۆزان ؟
لەخاکی پاکی پۆڵی پیرۆزان ؟
لە نێرگزجاڕان ، لەلای دڵارامان ،
لە مێرخوزاران ، لەلای گوڵەندامان

بەهاران ، لەگەڵ دەنگی هوزاران ،
هاوینان ، لەگەڵ زەنگی قەتاران
خەزانان ، لەگەڵ خاشاکی دۆڵان ،
زستانان ، لەگەڵ هاژەی شەپۆلان

چۆنە ؟ چۆن ئەژی لەگەڵ دڵبەران ؟
لەسەر ڕووباری سپی و ئەسمەران
بپرسە کاتێ لەبەر ڕووی وەستای :
ڕابردووی خۆش بوو یانەخۆ ئێستای ؟
جێگای وی خۆشە یا جێگای ئێمە ؟
بارەگای وی یان بارەگای ئێمە ؟
وەگەر لەناکاو پەنجەی نیوەشە
دوو پێڵوی نەخشاند بە کڵچوکی خەو
نقوم بووە نێو خەونی ڕابردووی ،
گێژی ئاواتی تاق بابردووی
چاوی خەواڵووی کەوتە ژێر برژانگ ،
خەرمانە هەڵهات لەچوار دەوری مانگ
پەری دڵداری هاتە بان سەری ،
خوڵی خواردەوە بە باڵ و پەڕی
تیری چەقاندە ناوەندی دڵی ،
بازووی ئالاندە گەردن و ملی
زەردەخەنەی گەش وەك تیشکی شەوسوو
خوێ نوواند لەسەر دەم و لێوو ڕوو
ئا ، لەو کاتەدا ئەی چەپکی قەشەنگ
ئەی ئاوارە ، ئەی یاقوتی بێ ژەنگ
ئا لەو کاتەدا لەسەر سینەکەی ،
لەسەر چوارپایەی زەرد و شینەکەی
پەڕت بکەوە لەمیان دەستی ،
بلاوێنەوە موچڕك و هەستی
بە بۆنی لالەو نێرگزو شەوبۆت ،
عەتری مێخەك و وەنەوش و هێرۆت
بڕوانە بالاو قەدی باریکی ،

ڕوخساری سافو زولفی تاریکی !
لەوێدا ، لەنێو ژووری ڕووناکی ،
لەتەك ڕایخو سەرینی پاکی !
وەی ! چەند قەشەنگە ، پەخشندەی خوایە
بووکی ڕازاوەی تاسەو نەوایە !
ئەی چەپکە گوڵی نەوبەهارەکەم ،
کاتێ کە ئەڕۆی بۆ لای یارەکەم
هەنگاو بە هەنگاو ، قۆناخ بە قۆناخ ،
لەم دۆڵو شاخە بۆ ئەم دۆڵو شاخ
هەڵگرە بۆ لای مرواری چاوم ،
هەڵمی حەسرەتو گڕی هەناوم
هەڵگرە بۆ لای فرمێسکی پێلۆم
لەجیاتی دڕو گەوهەرو لولوم
گیانم لەگەڵ تۆ لەنێو گوڵاوان ،
هەڵ ئەفڕێ بۆ لای تیشکی هەلاوان
کاتێ کە وەستای لەبەرامبەری ،
سەرنجت دایە تاجەکەی سەری
بڵێ : لاوەکەت «فەرهاد»ی کێوان
کەوتووە لەوێ لەڕەزی مێوان
وەکو چۆن «وەلی» مەلوول بوو بۆ «شەم»
ئاوا مەلولو ماتە وەکوو ئەم !
شێواوە هەردەم لەگەڵ ئاسکۆڵان
ئەسوڕێتەوە لەدەشت و چۆڵان
پاڵ ئەداتەوە لەسای درەختان ،
بە بەر با ئەدا داخی دڵ سەختان
لەسەر شاپەڕی بای یادگاری
ڕەوانەی ئەکا بۆ کردگاری

ئەویش ڕەوانەی ئەکا بۆ لای تۆ
خۆی بخاتە بەر دەگای قەلای تۆ
وەکوو یەخسیرو دیلو قولەڕەش
وەکوو دێوەرەو قەرەجی گەردەش
ئەپرسی لەچەم ، لەشەونمو تەم
لە گولی بێدەم ، لەمەلی بێخەم
کوا گولەندامو نەوجەوانی من ؟
کوا نەونەمامو ئەرخەوانی من ؟
کوا هۆگر ؟ کوانێ خۆری ڕۆشەنم ؟
کوانێ نیگاری باخو گولشەنم ؟
کوا پەری ؟ کوانێ ئێسك سووکی من ؟
کوا زەری ؟ کوانێ تازەبووکی من ؟
کوانێ ؟ لەکوێیە یاری نازدارم ؟
لەکام گۆشەیە بەهی بۆندارم ؟
کوانێ ؟ لەکوێیە ڤیانی دلم ؟
بەرامەو بۆنی خونچەی سەرچلم ؟
ووشەی بەتامو هەلبەستی چامەم ،
پرشنگی شەنگی پەیامو نامەم
ئارەزووی ڕیشەو زاخی هونەرم ،
خۆراکی ڕەگو زادی جگەرم
لەکام تەلاری نهۆم نهۆمە ؟
لەکام هەواری بێ ئاوو چۆمە ؟
ئەپرسی ، بەلام نایەتە بەر گوێی
دەنگێ لەشاخێ ، لەدارو چرۆێی
چ ڕەوای مافە ژیانی وابێ ،
ئاسۆری بەبێ پێچ و دەوابێ
ئا ، ئەی چەپکە گول ، ئەی پەیکی هەستم

ئەمانە بڵێ بە خۆشەویستم
هێدی ، لەسەرخۆ ، نەك بە پەلەپەل
بڕۆ دەی بڕۆ ، بڕۆ خوات لەگەڵ
بەڵام کاتێ کە خۆری ڕەنگاو ڕەنگ
سەری دەرێنا لەبەندەنی شەنگ
کپ‌کپ ڕژایە هەناوی یانان ،
گەڕا لەناخ‌و گیانی ئینجانان
شالووری شادی لە سایەداران
کەوتە زایەڵە بۆ هەرزەکاران
گوڵاوی بۆندار هەڵچوو لە گوڵان
پەروانە لەرزی لەدەورەی چڵان
گەلاوێژی ڕوون لەئاسۆی بەرین
ئاوابوو ، سەری نایە سەر سەرین
شەونم لەپۆپەی نێرگزی کەژاڵ
بریقایەوە وەك بزەی منداڵ
لاله لاسکی خۆی وەکو دڵداران
ئاڵاندە پەرو باڵی باڵداران
دیاربوو لە دوور بۆ بێگوناهان
وەکوو مەشخەڵی ئازادی خواهان
ئەوسا ئەی چەپکە گوڵی نەورۆزم
ئامۆژگاریت بێ ووتەی پیرۆزم
نەکەی دانیشی لەلای ئاوارەم
لەبەر پەیکەری ئەو قەد چنارەم
با پەڕی زیندووت بێتە ئاوزینگدان ،
خنج خنج گەڵاکەت بڕژێتە گوڵدان
با چاوت وەکوو چاوی کەساسان
بڕژاکێ لەئاست خودا نەناسان

چاکتره لەوەی کاری بەدکاران
ببینی ، یاخود ئەوەی خونکاران !
بۆ هەراش بوونی چقڵی نێو دۆڵان
هەڵئەکەچلێنن گوڵی تەپۆڵان !

هەولێر : ١٩٦٣

---

## فەرامۆشم نەکەی

بەهاران کاتێ گوڵ پشکوت لەگوڵزاری گوڵەندامان
خـوداوەندی جـوانی هاتـە بـانیـژەی دڵارامـان
شەرابی پاکی مەیخۆشان درەوشاوە لەنێو جامان
لەوێدا ، لەو کەیفگایەی کەتیبا بوین لەگەڵ رامان
فەرامۆشم نـەکەی گیـانە ئـەمن شایـانی باڵاتم
هـەتامـاوم لەدونیـادا تـروسکـەی ئـاڵو واڵاتم



لەهاوینا لەکاتێکا کە خۆر هەڵهات لەپشت کێـوان
کەزی تاڵتاڵو زێرینی ڕژایە سەر بـەیو سێوان
لەکـاتــێ هــەر دڵێ مــەسـتبـوو بـەمـیـسـكو عـەبـنـەری لێوان
لەوێـدا لەو هــەوارگـایـەی کـە زۆرجـار لێ ئـەبـین مێوان
فەرامۆشم نەکەی گیانە ، ئـەمن شایـانی باڵاتم
هـەتامـاوم لەدونیـادا تـروسکـەی ئـاڵو واڵاتم



لەپایزدا ، لەکاتێکا کـە باخ ڕووتـا لە کۆسـاران
کەوو قومری بە کۆڵ گریان لەسەر ئاواتی شاکاران
لەکاتێ گەردەلولی بۆر سوپای هێنا وەکـو هاران
لەوێدا لەو پێشەنگایەی کەتۆم لێ دی لەگەڵ یاران

فەرامۆشم نەکەی گیانە ، ئـەمن شایـانی باڵاتم
هەتاماوم لە گوڵشـەندا تـروسکەی ئـاڵو واڵاتم

* * *

لەزستانا ، لەکاتێکا هـەور گرمـا لەکوێی دۆڵان
گەواڵە کردیە ڕێژنـە لەسەر کێـوو چەمو چـۆڵان
لەکـاتێکا گیـاوگوڵت ئـەدەیتە پـۆلی ئـاسکـۆڵان
لەوێدا لەو پەرستگایەی کە ئەنـوارێتە کـردۆڵان
فەرامۆشم نەکەی گیانە ، ئـەمن شایـانی باڵاتم
هەتامـاوم لەگوڵشـەندا تـروسکەی ئـاڵو واڵاتم

ئەرادن : ١٩٥٦

---

# ئەگەر

ئەگەر خۆری بەیان هەڵهات لەبەر کۆشکی شەبەقداران
گلۆلەی تیشکی داوداوی درەوشاوە لەسەر داران
پەرِندەی چەم چریکاندی لەچیمەنزاری نازداران
ئەگەر بۆنی گوڵان پەرت بوو لەنێو ئاهەنگی دڵداران
ئەبێ گیانە بە دڵپاکی
بە ناخی پڕ لە ڕووناکی ..
بەیادمکەی لە گوڵشەندا لەگەڵ ئاوازی باڵداران !



ئەگەر مانگی جوان دەرکەوت بەرامبەر پەنجەرەی پاکان
تریفەی چاوی ئەستێران گەیشتە گیانی خەمناکان
پەری حەز هاتە بەر دیدەی خەواڵووت چەشنی بێباکان
ئەگەر پێڵوت لە کلچوکدا بە خەونی خۆشی ڕووناکان
ئەبێ گیانە بە دڵ پاکی
بە ناخی پڕ لە ڕووناکی ...
بەیادمکەی لەگوڵشەندا لەخەونی خۆشی دڵچاکان !



ئەگەر بووکی بەهاری شەنگ گەڕا وەك ڕاژیلەی شادان[1]
چووە سەردانی گولزاران لەگەل چینی پەری زادان
لەچۆپی تاقی نەوروزت سەری هەلدا بە خۆبادان
ئەگەرمەی گێری شاکاران شەرابی ڕێژتە نێو بادان
ئەبێ گیانە بە دلپاکی
بە ناخی پڕ لە ڕووناکی ..
بە یادمکەی لەگولشەندا لەنێرگزجاری ئازادان



ئەگەر خێلی خەزان دەرکەوت لەڕێی خێلی هونەرمەندان
لەشانان هەنکی ڕەنگاو رەنگ فرین بۆ کێوو دەربەندان
پەپولەی قنج لەنێو وەردان لەخۆچوو ، هاتە ئاوزینگدان
ئەگەر هەنگوین لەچنگ مەندان نەما ، شیلە لەنێو قەندان
ئەبێ گیانە بە خەمناکی ،
بە ناخی پڕ لەسامناکی ..
بەیادمکەی لەچەمبەردا لەگەل نالەی سیامەندان



رایات : ١٩٥٩

---

(١) ڕاژیلە : مدلل

# ئەشكی نامرادی

لەسەر تۆپەنگی ئازادی
ژیام كاتێ بە دڵشادی
ئەوێستاكەش بە بەربادی
بە ناخۆشیو بە ناشادی
ئەرێژم ئەشكی بێدادی ![1]

* * *

لە سایەو سێبەری دارم
لە نێرگزجاڕی بۆندارم
لەوێ ، یاری ئەویندارم
ئەدی ئێستاش لەسای یادی
ئەڵێم : كوا قەدی شمشادی ؟

* * *

لە كوێ ما دڵبەری شەنگم ؟
بەیو نارنجو لالەنگم
لەكوێ ما تابە دەردەنگم ؟
بڵێم پێی : تۆ پەری زادی
وەكو (شیرن)ی (فەرهاد)ی !

* * *

گەڕام خاکی وڵاتی خۆم
بەشوێن بوکی خەڵاتی خۆم
گەڕام شارو قەڵاتی خۆم
لە (هەولێر) تا (مەهاباد)ی
نەبوو وێنەی لەئیجادی !

* * *

نەبوو هاوتای لەمەنگی‌دا
لەکۆکی و شۆخو شەنگی‌دا
لەچالاکی و چەلەنگی‌دا
لەشاخی خاتو (خانزاد)ی
لەباخی پڕ سەباو بادی !

* * *

نەبوو شێوەی لەنێو شێوان
لەسای داری بەیو سێوان
لەپاڵ یاڵو کەژو کێوان
لەخاکی پاکی ئەژدادی ،
لەجێو دێو بنیادی !

* * *

لەهاوینا هەوارگام بوو
لەزستانا پەرستگام بوو
بەهاران بۆنی ڕێگام بوو

خەزانان شەککەرو زادی ،
بەناو پشتگیرو فریادی !

* * *

هەموو ئاواتی زاوایيم
گەزاف و لافو خۆبایم
ترۆپکی بەرزو بالایم ..
ئەما ، گشتی بە بەربادی
لەوێ وونبوون بەنامرادی !

* * *

فەلەکەك چەرخت سەرەوژێر بێ
وەکو من خەم بەتۆ فێر بێ
ئومێدت هەر لەهەڵدێر بێ
چی جەللادێکی جەللادی ؟
چی بێدادێکی بێدادی ؟

* * *

سولاف : ۱۹۵۹

---

(۱) ئەشك : فرمێسك

# دڵی من

دڵی من ، ئەی دڵی یەك ڕەنگ — هەتاكەی ئەی دڵی بێ ژەنگ
ئەناڵێنی لەسەر مەرگی — تەمەن كورتی جوان‌و شەنگ ؟

هەتا كەی وا بەخەمناكی ..
ئەژی ئاوا بە سامناكی
سەرنجی پڕ لەڕووناكی ..
بەرە بۆ شامەلی پاكی ...

ئەچریكێنی بە سەد دەردەنگ — لەسەر گۆنای بەی‌و لالەنگ
ئەتۆش هەردەم لەتەنیایی — ئەسووڕێی هەر وەكو گێژەنگ

لەبەرچی بێ دەم‌و زاری ؟
لە دووركەی زام‌و ئازاری ؟
لەبەرچی ؟ بۆچی بێزاری ؟
بەهارت ، یاخۆ گوڵزازی ...

وەریوە ، یا بەپولەی شەنگ — فریوە ، یانەخۆ مێشهەنگ ؟
سەرنجێ بۆ گوزاری گوڵ .. — بەرە ، بۆ شەونمی تۆپەنگ

چی لولوی تاجدارێكە ؟
چی دوڕی پایەدارێكە ؟
چی نەشئەی نەشئەدارێكە ؟
ڕەوای هەر بەهرەدارێكە

لەئاست تیشكی بەزیل‌و زەنگ — ئەخوێنێ پۆڕی ڕەنگاو ڕەنگ
ئەتۆش ئاوا گوڵی هیوات — ئەخەیتە گۆڕی تارو تەنگ[1]

هەتاکەی خۆت ئەڕوتێنی ؟
پەڕو باڵت ئەسوتێنی ؟
لەبەرچی خۆت ئەفەوتێنی ؟
دە خێرا تا لەسەر تێنی ...

گەرمکە خۆشترین ئاهەنگ لەڕێ دەورانی لارو لەنگ
دە لادە نوزەنوزی خۆت دڵی من ئەی دڵی بێژەنگ !

هەولێر : ١٩٥٩

---

(١) تار : تاریك

# کاتێ

کـاتـێ کـەنجـێکـی ئـازاو دیـار بـووم
ئـاواتی هـەمـوو جـوانـانی شـار بـووم
بـەلام کـەپـیر بـووم ، چـەمـاوە پشتم
جـوانـان نـەمـان لەدەورو پـشـتـم

* * *

کـاتێ لەشێـوەی مـەڕ بێ زەرەر بـووم
شادو ڕووخۆش بووم ، بەبێ کەسەر بووم
بـەلام کـە خـۆم دی لەشێـوەی گـورگم
کـەسـەر ڕنـۆکی چـەقـانـدە قـوڕگم

* * *

کـاتـێ کـە هـاوڕێم لاتو هـەژار بـوو
ئـامشۆی بـۆ لام ڕۆژێ سـەڕ جـار بـوو
بـەلام کـە هـاوڕێم کـەوتـە هـەبـوونی
مـنـی لەبـیرکـرد لەنـێـو نـەبـوونـی

* * *

کـاتێ کـەجێی پێم نـزمو نشێـو بـوو
چـاوم لەلوتـکـەی بـلـنـدی کـێـو بـوو
بـەلام کە جێی پێم بلند بوو کـەم کـەم
زانـیم لەکـەوتـن نـێـزیـکـم هـەر دەم !

* * *

کـاتـێ بێـسـتـانـم پـڕ چـەمـیـلە بـوو
چـواردەورم پـڕ لە قـەومو قـیـلە بـوو
بـەلام کـاتـێ کـە بـێـسـتـانـم ڕزی
ئـەوەی لەقـەومو قـیلەم بـوو خـزی !

هەولێر : ١٩٨٠

# ئەی میدیا

بۆ گۆرانی

ئـەی مـیـدیـا ، ئـەی مـیـدیـا ،
ئـەی پـەری شـەنـگـی چـاو سـیـا
ئـەی مـیـدیـا
وەی چـی لەنـجـەیـە لەنـجـەکـەت
نـەخش و نـیـگـاری پـەنـجـەکـەت
بـەفـیـڕۆ نـەچـوو ڕەنـجـەکـەت
چـەنـد خـۆشیت داوە گـەنـجـەکـەت
لەکـوێـمـا ؟ کـوا سـەرنـجـەکـەت ؟
چـی جـادووێ بـوو ؟ چـۆن ژیـا ...
لەتـاف و لاوی گـەنـجـیـا ؟
ئـەی مـیـدیـا

* * *

سـوێـنـدم بـە ڕەنـگـی چـاوەکـەت
بـە داوی زوڵـفـە خـاوەکـەت
هـێـشـتـا دوو پـیـتـی نـاوەکـەت
لامـن ، لەسـەر نـووسـراوەکـەت
لەتـەک شـوشـەی گـوڵاوەکـەت ...
لـێـرە ، لـەژووری دڵـنـیـا
پـێـکـەوە ، نـەک جـیـا ، جـیـا
ئـەی مـیـدیـا

* * *

گیانم بەساقەی دڵبەرم
بە نەرمو نوڵی ئەسمەرم
هەڵسە وەرە بەر پەیکەرم
وەرە بەر گیانو جگەرم
ئەتۆی هاوڕازو هاوسەرم
ئەتۆی دڵخوازی چاو سیا
ئەی نەوەی (زەند)و (میدیا)
ئەی میدیا



کاتێ ئەڕۆی لەسەر شەقام
وەك فریشتەی بەهەشتی خوام
وەك گوڵەندامی نەونەمام
خۆخو سێوو بەیو شەمام
ئەمانە گشتی دێنە لام
ئینجازو زەیتونی سیا
هەڵۆژەو هەنجیری چیا
ئەی میدیا



هەڵسە وەرە بۆ دەستگەمە
بۆ گەنجەفەی نێو ئەم چەمە
چەند لە دەمو سینەو مەمە
ڕنیم ، بەڵام هەر ئەو دەمە
گەرامەوە ، ووتم : کەمە

ئەبێ زیاتر بێ زیا ..
بەشم لە بیری بێ ڕیا
ئەی میدیا

* * *

ئەی شۆخو شەنگی دڵنیام
بەتیشکی باڵات لە چیام
بووژایەوە سەوزە گیام
لەگوڵشەنی جیا ، جیام
لەپاڵ بەردی سپی‌و سیام
ئامادەیە وەك ئەشقیا
لولت بدا لە ڕێی چیا
ئەی میدیا

* * *

هەناسەت ڕوا بە گوڵاو
بە بۆنی باخی بەر هەتاو
هەر ئاوا گوڵی شۆخو لاو
مەستە بە سروەی نەرم‌و خام
بەتەزووی شەونم‌و خوناو
بەعەنبەری گیانی گیا
ئەوەی هەوێنم پێی ژیا
ئەی میدیا

* * *

گوڵەنگی شەنگی پەنجەرەم
ئەم شادو ئەم بەختەوەرەم
ئەم ئاوو دارو سێبەرەم
لێرە ، لەم بەرو لەو بەرەم
بەرەو ئەم جێیە لاپەڕەم
بەرەو چەمو کەژو چیا ..
بانگت ئەکەن لەخۆشیا :ـ
ئەی میدیا :
ئەی میدیا :

* * *

خەلیفان : ١٩٦١

---

# ئەی مەی گێری لاو

ئـەی مـەی گـێـری لاو ، هـاودەمـی جـاران
ئـەی چـرای گـەشی شـەوی بـێـداران[1]
بـێ ، دابـنـیـشـیـن لای جـوانـکـاران
گـوێ دەیـنـە ژەنـەی مـەلی هـەواران
ئـەمـڕۆکـە ڕۆژی بـەزمو سـەیـرانـە ،
لەهـەر لایـەوە لاوکو حـەیـرانـە !



بـێ ، بـا ڕابـوێـریـن لە پـاڵ چـنـاران
لەئـەنـجـومـەنـی دیـدە خـومـاران
ئـەتـۆ مـەی مـنـیش نـەوای هـوزاران
لەگـوڵشـەنـدا لە کـەیـفـگـەی یـاران
ئـەمـڕۆکـە ڕۆژی بـەزمو سـەیـرانـە ،
لەهـەر لایـەوە لاوکو حـەیـرانـە !



بـێ بـا ڕاکـشـێـین لە مـێـخـوزاران
پـاڵکـەویـن لەسـەر گـیـای بـنـاران
پـاکـوڕێ سـازکـەیـن وەك هـەسـتـیـاران
لەئـاسـت بـانـێـژەی بـوکـی بـەهـاران
ئـەمـڕۆکـە ڕۆژی بـەزم و سـەیـرانـە ،
لەهـەرلایـەوە لاوك و حـەیـرانـە !

بێ ، نێره ، لاده لەشاری ماران
لەکێو گەڵ دڕندەو هاران
لەدزو جەردەی ڕێی ڕێبواران
لەوانەی بونە زامی هەژاران
ئەمڕۆکە ڕۆژی بەزمو سەیرانە ،
لەهەر لایەوە لاوکو حەیرانە !



چی هەیە لەنێو کۆشکو تەلاران ؟
بێ گوێبدەینە کەوی کۆساران
لەوێ ئەخوێنێ وەکو شاکاران
لەنێو بەهەشتی پۆلی نیگاران
ئەمڕۆکە ڕۆژی بەزمو سەیرانە ،
لەهەر لایەوە لاوکو حەیرانە !



سبەی پایز دێ وەك ستەمکاران
هەڵمەت ئەباتە سەر لالەزاران
نە دار ئەمینی نە گەڵای داران
نە بناری، خۆش ، نە بای بناران
دە هەڵسە تاکو بەزمو سەیرانە ،
گوێ گرە تەیران ، جەژنی تەیرانە !



(١) بێدار : بێخەو ، ساهر

# بەخێر بێی

بەخێر بێی نەوجەوانی من
چریکەی ڕووی قەوانی من
وەرە ئەی ئەرخەوانی من
وەرە مانگی شەوانی من
وەرە ئێرە، لە تەنیایی،
بنۆشم ئارەقی خوایی!



لەبادەی لێوی ئاڵی تۆ
لەتاسەی چاوی کاڵی تۆ
بەرامبەر تاقە خاڵی تۆ
لەئاست وێنەی خەیاڵی تۆ
گەرمکەم وا بە سانایی،
زەماوەندێکی دوولایی!



نەبێ شێوەی لەنێو شارم
لەفیکەی دوزەلەو تارم
نەبێ هاوتای لە گوڵزارم
لە دۆڵو کێوو کۆسارم
نەبێ وێنەی لە چۆلایی،
وەها بێ تاکو کۆتایی!

وەرە ئەی ڕۆژ هەڵاتی من
قەرالیچەی وولاتی من(1)
وەرە مژدەو خەڵاتی من
گوڵەندامی قەڵاتی من
دە خێرا ئەی لەخۆ بایی ،
مەتۆرێ لێم بە خۆرایی !

★ ★ ★

گوزاری تۆ گوزارێکە
گوزاری ڕووی بەهارێکە
نەوای هەر سازو تارێکە
لەهەر دەردەنگو زارێکە
لە دێهاتو لە ئاوایی
لە نەخشی هاتو چۆی شایی

★ ★ ★

ئەوەندە شۆخ و شەنگی تۆ !
پەپولەی باخۆ هەنگی تۆ ؟
لەهەر گیانێ گەزەنگی تۆ
پەریزادەم لە ڕەنگی تۆ ...
دیارە ، ئاڵو والایی
تەلیسمی بەرزو بالایی

★ ★ ★

فریشـــتەی مـن وەکـو تـۆ بـوو
پەری بوو ، چەشنی زارۆ بـــوو
بـە دیمەن خۆری ئاســـۆ بـــوو
گولیکـــی ئـاڵـی شەوبۆ بـــوو
بـە بـــێ ســـپیاو وسۆرایـی
جـــوان بـــوو شۆخـی ڕاڕایـی

★ ★ ★

دوای ئـەو مـــن ژیانـــم چـوو
بــــەهـاری بـێ زیـانـم چـوو
دوای ئــــەو مــن ڤیانـم چـوو
دلارامــــــــی نیـانـــم چـوو
نـــە ڕەنگم مـــا ، ئـازایــــی
نـــە لافـی تـافـی زاوایـــی !

★ ★ ★

هەولێر : ١٩٥٩

---

(١) قەرالیچە : شاژن ٠

# کچێ

کچێ چەند نەرمو نۆڵو نازداری ؟
چەند گورجو گۆڵو چەند ووریشەداری ؟
زەری کام دەریای لەبیر کراوی ؟
پەری کام دونیای تریفەداری ؟
تەفرەدراوی کامە هەرێمی ؟
نەوەی کامە شاو کامە سەرداری ؟
بۆنی کام گوڵو لەرەی کام چڵی ؟
خونچەی کراوەی کام لقەداری ؟
کام جوانکاریێ تۆی داهێناوە ؟
دەسکردەی دەستی کام بەهرەداری ؟
لەکێت دزیوە ئەم جوانی یە ؟
لەکام گوڵشەنو کام گوڵشەنداری ؟
بۆکێ ڕازاوی ؟ بۆ کام بانیژە ؟
مێوانی ماڵی کام لەنجەداری ؟
کام ئەمەکدارت ڕەچاو کردووە ؟
بووکی ئاواتی کام ئەمەکداری ؟
بەرەو کام ئاهەنگ ئەڕۆی بە چوستی ؟
چیت لە ئاهەنگە ، خۆت ئاهەنگداری
خۆت بەزمو ڕەزمی ڕووی ئەم زەمینەی ،
خۆت زەماوەندو خۆت ڕەونەقداری
خۆت چۆپیو بە خۆت شاییو شاباشی ،
خۆت گەرم کەری سەمای سوڕداری
وێنەت سەراپا وێنەی حۆری یە ،
وێنەی لەکوێ بوو تۆ وێنەداری

شێوەم نەدیوی لەم وولاتەدا
نە لەشارو نە لەدێی گوڵداری
نە لە دۆڵو نە لەکەژو کێوی ،
نە لە جێو نە لە ڕێی گەوەداری[1]
لە هونەرخانەی هونەرپەروەران
وەك خوداوەندی بەخشندەداری
زۆر گەشی ئێجگار گەشتر لەپڕشنگ ،
زۆر گەشی ئێجگار تریفەداری
دەمێ خۆر ، دەمێ پەلکەڕەنگینەی ،
دەمێ ئاوێنەی ڕووی شەبەقداری
دەمێ پەروانەی دیار خەرمانەی
دەمێ خەرمانەی مانگی ڕەنگداری
دەمێ ساز ، دەمێ مۆسقای (جاز)ی ،
دەمێ ئاوازی چریکەداری
چی نەمامێکی ؟ چی شەمامێکی ؟
چی بەتامێکی ؟ چی عیشوەداری ؟
چی‌ناز ؟ چی نیاز ؟ چی دڵخوازی تۆ ؟
چی ڕاز ؟ چی ئاواز ؟ چی نەشئەداری ؟
وەك دڵارامی ئەندێشەی باڵا
پێ داویێی ، وەکو ئەو چرپەداری
وەکو ئەو لەسەر عەرشی جوانی
دانراوی ، لەسەر عەرشی دڵداری
فەرمان بگێڕی بەسەر لاوچاکان ،
نیشانەیێ بی لە حوکمداری
کێ هەیە نەڵێ : وەك چرا ئاوای
کێ هەیە نەڵێ : تروسکەداری
چەلەنگی وەکو «ڤینۆس»ی شەنگی

قــەشــەنـگی ، ڕەنـگی دوڕی ڕۆنــداری
وەك «شیرین» ەکەی «فەرهاد»ی بێستـوون
یـاخود «زین» ەکـەی «مـەم» مـژدەداری
ئــەشێ نــاوبــانـگـت وەکـو وان بـڕوا ،
لە ئـێستــاکـەوە تـۆ نـاوبــانـگـداری
ســروشت ســەراســەر لەپـەیکـەری تـۆ
خـەوتـووە لەش و گـیــانــی ئـاوداری
بـەسینە شـووشە ، بـە بـازوو کـافـور ،
بـە چاو ئـاسکۆڵەی ســای شـەنگـەداری
تـۆ گوڵشــەنی ، تـۆ خـۆری بـەنـدەنی ،
تــۆ ڕۆشــەنــی ، تــۆ بـڵێــســەداری
هـەرچـەنـد بـەبـەژن و بـالآت هــەڵبڵێم
هــەر کـەمــە چـونکـە گـەڵێ نـازداری
جـوانـیت لەژیـن ســمـفـونـی‌یـەکـە ،
خـودای ســمـفــونــی دێــتــە دیـداری
کـچـێ مــن ئـەگـەر بـاڵداری تـۆ بـم
ئـەتـۆش ئـەنـدێشــەی ئـەوای بـاڵداری
ئــاگــادارم لێـت ، لەجـێـگــاو لەڕێـت ،
بـێ‌ئـاگـای لەمن ، یـا ئـاگـاداری ؟ !

هەولێر : ١٩٥٤

---

(١) گەوەدار : پەناوپێچ

# ڕاژیلەی دڵدز

ڕاژیلەی قشتو ئەسمەرە[1]
پڕشنگی گیانو جگەرە
سەیرکە ئەم بەختەوەرە
چەند جوانێکی دڵبەرە ؟



پەرچەمی خاوی قەفقەفە
ددانی ڕیزی سەدەفە
زۆر ڕێكو پێکە سەفسەفە
سینەی بەللورو مەڕمەڕە



گۆنای گوڵی ڕۆخ چەمەنە
بزەی بەهاری تەمەنە
لەنێو جوانان دەگمەنە
شیرینە هەروەك شەککەرە



سەیرکە لارو لەنجەکەی
گوڵێکی ئاڵی پەنجەکەی
زانیومە کێیە گەنجەکەی ؟
بۆ ڕوو ئەکاتە ئەم بەرە ؟

ئەڕوا لەسەر شەقامەڕێ
بەرەو خوارو بەرەو سەرێ
هەر سەرە بۆی دێتە دەرێ
لەدرزی دەرگەو پەنجەرە

* * *

حۆرییە یانە پەرییە ؟
فریشتەیە یا زەرییە ؟
تاجێکی لەسەر سەرییە
هی حەزە ڕووگەی هونەرە

* * *

تەماشای کە چی نەخشێکە ؟
چی دڵدز تاسە بەخشێکە ؟
چی خاوەن تاجو عەرشێکە ؟
جوانی کامە کیشوەرە ؟

* * *

بە دیدە پەریزادەیە
مەی و شەراب و بادەیە
نهادی ئەم نەژادەیە
جێی کەوشی سەر چاوو سەرە

* * *

شەقلاوە : ١٩٥٥

---

(١) ڕازیلە : مدلل

# ئەبین بە یەك گیان

**دایلۆج**

- چی پێ بڵێم گەر گەڕایەوە ماڵ
ڕوانی‌یە دەورەی تۆی نەدی لە پاڵ ؟
- بڵێ : لەبەر تۆ نێژرا لەژێر خاك

* * *

- ئەگەر کڵافەی هەوری خەمناکی
ئاڵایە ئاسۆی چاوی ڕووناکی ؟
- دڵی بدەوە وەك خوشکی دڵ پاك

* * *

- ئەگەر لێی پرسیم بەهەناسەی سەرد :
چی ووت کە ڕۆیی نازداری بێ گەرد ؟
- بڵێ پێکەنی وەك مانگی ڕووناك

* * *

- ئەگەر فرمێسکی گەرم لەچاوی
هەڵقوڵا لە داخ خەمی هەناوی ؟
- فرمێسکی لادە بەپەڕی لای‌لاك[1]

* * *

- ئەگەر داوای‌کرد بە تکای بێ غەش
بیهێنمە سەر کێلی گڵکۆی ڕەش ؟
- نەکەی دامناوی لەجیاتی داك
* * *
- ئەگەر وەك وێلان ڕووی کردە چۆلان
کەوتە گفتوگۆ لەگەل ئاسکۆلان ؟
- بێ بەشی نەکەی لەنان و خۆراك
* * *
- ئەگەر لەشێوەی «فەرهاد»ی دڵدار
چووە گژ چیای «بێستون»ی ناودار ؟
- وازی لێ بێنە هەروایە زگماك !
* * *
- ئەگەر هەر وەکو «خورشید»ی «خاوەر»
لە دۆڵان ماوە بێ یار و یاوەر ؟
- یاریدەی بدە وەکو سوار چاك
* * *
- ئەگەر حەزتان لەلاپەرەی ژین
بووە ئەفسانەی حەزی «مەم» و «زین» ؟
- هی وان ئەفسانە ، هی ئێمە سەرپاك
- ئەگەر لەسەرخۆ وەك گەلای شەوبۆ
گیانی هەڵوەری‌و فڕی بۆ ئاسۆ ؟
- ئەبین بە یەك گیان لە لەشێکی تاك !
هەولێر : ١٩٥٧

---

(١) لای لاك : لَيْلَكَة

# چی ماوەتەوە ؟

چی ماوەتەوە پاش گەڵاڕێزان   ئەگەڕێتەوە بەرەو گوڵزارم
بێجگە لە پلوپۆشی پەڕێزان   شتێ نابینێ لەزەوی‌و زارم

*

بەهارم لەسەر گالیسکەی تەمەن   ڕۆیی خەزانم هاتە هەوارگەی*
گوڵشەنم چۆڵ بوو ، نە گوڵ ، نەچەمەن   نە ڕاوکەرێ دێ ڕووکاتە ڕاوگەی

*

نە پیالەی مەی لەچنگ مەیگێڕان   نەبریقێتەوە ، نە نارنج ، نە بەی
نە تەلی کەمان لەکوێی قژ زێڕان   دەنگ نەداتەوە ، نە بلوێر ، نە نەی

*

نە قومری لەسەر هێلانەی شەنگی   دێ هەڵنەنیشێ ، نە پەرەسێلکە
نە شالوور بێچوی ژیرو چەڵەنگی   زاخ ئەدا ، نە زاخ ماوە نە هێلکە

*

نە لە هەورازان چینی دڵبەران   ئەگەڕێن وەکو کاتی ڕابردووم
نە کەوی کۆسار لەسای سێبەران   ئەقاسپێنی بۆ کەلای با بردووم

*

نە دڵارامان بە مانگەشەوان   هات و چۆ نەکەن لەگەڵ کۆچەران
نە خەونگەی خۆش ماوە بۆ خەوان   نە ژوانگە بۆ جوان پەروەران !

*

نە «نەفرودێت» دێ لەسەر مێرگوڵان   ڕابکشێ لەوێ لەئاست شاکاران
نە «ڤینۆس» لەگەڵ شۆخە کچۆڵان   ئاهەنگ بگێڕی بۆ جوانکاران

*

نە تارای سەری لە بەرامبەرم   دیارە نە ڕوو ، نە بزەی قەشەنگ
نە بەرگی بەری لەدەورو بەرم   توانج ئەگرێتە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ

*

نە جوانترین چۆپی بە لەنجەی   ئەهۆنێتەوە بۆ گوڵەندامان
نە بەهاترین تابلۆ بە پەنجەی   ئەکێشی‌و ئەیدا بە دڵارامان

هیچ نی‌یە ، تەنیا کەلاوەی هیوا ،     تەنیا دەشتێکی بێ جەنگەڵو باخ
نازانم کوو بوو ئەم ژینەم پیوا     بەرەو ئاوا بوون قۆناخ بە قۆناخ

●

ڕەورەوەی ژینم ڕۆیی بە چوستی     ئەمکرد ڕای‌گرم کاتێ تێپەڕی
تاکوو تێ بگەم چی‌یە مەبەستی ،     یاخۆ بزانم ڕووگەی سەفەری

●

کوا پەری ؟ کوانێ ئەو شۆخە لاوەم     بگەڕێتەوە بە دڵنیایی ؟
کوا زەری ؟ کوانێ بووکی ڕازاوەم ؟     کوانێ کەژاوەی شەوی زاوایی ؟

●

کوانێ «کیوییدە» بێهوی دڵداری     بسوڕێتەوە لەدەوری سەرم ؟
هەردوو شاپەڕی بە وەفاداری     بنالێنێتە هەردوو شاپەڕم

●

بوەستێ لەئاست پۆلی نازداران     وەکو خونکاری پۆلی دڵخوازان
وەکو تاجدارێ لەنێو تاجداران     فەرمان بگێڕێ بەسەر چاوبازان

●

بەڵم پێوەنێ بە هەستێکی نوێ     بەرەو سەرچاوەی بەهرەی نەدیتراو
یا ئەندێشەیێ وەك شە پۆل‌زێ     هێرشی باتە چامەی نەوتراو

●

نی‌یە ئیانی هەنگو پەروانەم     هان بدا بەرەو چرای شەوگاران
دووبارە ڕۆژو مانگو خەرمانەم     بخاتە بەر ڕووی چینی نیگاران

●

کامە ژێم ژەنی بە سەری پەنجەم     دەنگی نەداوە لە گوێی کەساسان ؟
کامە زایەڵەم خستە کەمەنجەم     پێی نەهەژاوە دڵی خواناسان ؟

●

بۆ هێناتەوە نیهادی یادم     ڕۆژی ڕووناك و شەوی پیرۆزم
کێ تیمار ئەکا زامی بێ دادم     تا بۆی ساز بکەم چۆپی نەورۆزم ؟

●

تا پێی ببەخشم پەیامی خۆشم ،     نامەی ئەندێشەو برووسکەی هەستم
چەژی خۆشاوی ناخی بە جۆشم ،     هەوێنی تاسەو مایەی هەڵبەستم

●

پوله‌ی هه‌زار بووم بۆیه زۆرداران — داغیان پێوه‌نا به دڵو گیانم
وو‌تیا : بابێته په‌ند بۆ هه‌ژاران — ئاوا هه‌لوه‌ری گوڵی ژیانم !

*

چی ماوه‌ته‌وه پاش گه‌لارێزان — ئه‌گه‌رێته‌وه به‌ره‌و گوڵزارم
بێجگه له‌پلوپووشی په‌رێزان — شتێ نابیتی له‌زه‌وی‌و زارم !

*

هه‌ولێر : ١٩٥٧

---

(١) ئافرودیت : خواژنی جوانی
(٢) کیوبید : خوداوه‌ندی دلداری ، به‌پێی ئه‌فسانه‌ی یونانی کۆن
* گالیسکه : عه‌ره‌بانه

# گوڵی دڵداری

خەوت دزیوە لە هەردوو چاوم
دڵت دزیوم ، بەبێ دڵ ماوم
ئەبێ راتگرن لە دادگادا
سزات دەن ، بەڵام نەك لەبەر چاوم
لەپڕێکەوە دێ‌ی دڵم ئەبەی
وەك ئەوەی کە دێ ئەبا دراوم
سەرەڕای ئەوەش ئەڵێی دڵی تۆ
لەلای من نی‌یە ، بەد مەکە ناوم
برژانگی پێڵوت لەت لەتی کردم
ئاگری بەردا جەرگو هەناوم
وەرە چارەیێ بکە بە زامم
بە ئاخو داخی ناخی سووتاوم
شەو تا بەیانی لە یادی منی
بۆیە هەوری خەم گەمارۆی داوم
بەڵام تۆ منت لە یاد کردووە
ئەگەرچی ئەڵێی لەیادت ماوم
ئەگەر ئاوابوای ، وەك چۆن ئەڵێی وا
ئەکەوتیە وای گیانی هەڵاوم
بێنەوە یادت شەوی ژوانیم ،
کاتێ کە ووتت : لێرە وەستاوم
کاتێ کە بازووت ئاڵاندە ملم ،
شانت چەقاندە شانی بەتاوم
ووتت : لاوە من بۆتۆ خوڵقاوم ،
بۆ هەستی باڵات ئاوا ڕازاوم

گەر بەتۆ نەبی شوو بەکەس ناکەم
ئەبی بۆ تۆ بێ قەندو شەکراوم
گوڵ بۆ بولبولی دەنوك یاقووتە
نەك بۆ ڕیشۆڵەی ڕەش هەڵگراوم
بێ ، ئەی پەڕندەی ئاسۆی بەهەشتم ،
بێ ، ئەی گوشەندەی کەژ و بەراوم
بێ تابخنکێین لە گێژەنگی حەز
ووتم : دەمێکە تییا خنکاوم
شەپۆلێ ئەدا لەتۆقی سەرم
بگە هاوارم نەکو فەوتاوم
لەئاسۆی چاوت ئەدرەشایەوە
ئەستێرەی هیوای ڕووردەوشاوم
کوا ئەستێرە ؟ کوا درەوشانەوەی ؟
کوا ئاسۆ ؟ کوانێ خەونی نەخشاوم ؟
کوا ئەنگوستیلەی کاتی خوازبێنیم ؟
کوا شیرینی ؟ کوا جامی خۆشاوم ؟
چۆن لەیادت چوو ژمارەی تەلم ؟
چۆن لەیادت چوو نیشان و ناوم ؟
شارو هەوارکەو گەڕەکو ماڵم ،
پەنجەرەو دەرگای دانەخراوم
ئەو نووسراوانەی بەخوێن ئەنووسران
لێرە لەژووری بۆیاخ کراوم
لەبەرچی ئاوا بێوەفا دەرچووی ؟
لەبەرچی گۆڕای من نەگۆڕاوم
هەوارگەت کوانێ ؟ کوانێ دەستگەمەم ؟
ژوانگەت کوانێ ؟ کوانێ دەراوم ؟
نازداریت کوانی ؟ تۆ بڵێی مابێ ؟

دڵداریت کوانێ ؟ دڵداری خاوم
گومرای ناکەم گەر بڵێم : خاوی
بێ ئەمەگ دەرچووی بۆ دڵی لاوم
بزەی سەر لێوت ڕای کێشام بۆ خۆی
باوەڕی پێکرد چاوی بڵاوم
ئەمنی هەستیار گەلی بێ چارەم
لە ئاست جوانان کەچی پیاوم
بەلارو لەنجەی شۆخە کچۆڵان
زوو ئەخلیسکێ پانی ی پێلاوم
نیگاری شەنگی دیمەنی بالات
لامە ، ئەمینێ ، هەتاکو ماوم
پێی هەڵ ئەبەستم هەڵبەستی خۆش خۆش
هۆنراوەی وەکو میسکو گوڵاوم
دای ئەنێمە نێو چوارچێوەی زێڕین
لەتەنیشت وێنەی لەڕەنگ دراوم
لەو ماوەی دوورو درێژەی کەچوو
بە ئاخو داخی ئەشکی تکاوم
ئەو وەفای لەتۆ زیاتر بوو بۆم ،
ئەو بووە دەوای زامی پێچراوم
ئەو فەرامۆشی ئەدایە گیانم
خۆشی ئەخستە هەستی تەواوم
ئەفسونو جادوی دڵنیایم بوو ،
بۆژینەوەری ڕووی پەشۆکاوم
لەکاتێ کەوا لەیادت نەبووم
نەتزانی کەوا لەکوێ چەقاوم ؟
لەکامە دەشتو چۆڵو ڕێیەکم ،
لەکامە دۆڵو چەمو شەتاوم ؟

ئـەو تـاقـە گـوڵەی کـە بـەخشیتـە من
لەژێـر داربـەڕووی پـیـرو چـەمـاوم
وەك جـەڤەنگێ بـوو بۆ یـەکـەم دیـدار ،
بـۆ یـەکـەم عـەشـقی هـەڵپـڕوکـاوم
هـێشـتـاکـە مـاوە لە گـوڵدانـی شـین
ئـەمـێـنـێـتـەوەش هـەتـاکـو مـاوم
بـەڵام ـ مـخـابـن ـ سـیس‌و ژاکـاوە
لەشـێـوەی دڵی سـیس‌و ژاکـاوم
ئـەمن ئێـستـاکـە مـردوو ئـەژمـێـرێم
ئـەگـەرچـی وەکـو زیـنـدوو دامـاوم
ئـەگـەرچی هێـشتـا بـێ‌تـەرم‌و گـۆڕم
لەچـاوی سـپـی لول نـەدراوم
نـەئـەبـوا لەخـۆم زیـاتـر هـەڵێـم
زیـاتـر بـاوێـم وورده هـەنـگـاوم
تـۆ لەنـێـو دۆزەخ هـەڵڕێـژراوی
مـن لەسـەر زەوی هـەڵڕێـژراوم
چـۆن گـڵ‌و ئـاگـر دێـنـە یـەك ڕادە
تـۆ لەئـاگـر مـن لە گـڵ خـوڵقـاوم !

شەقلاوە : ١٩٥٥

---

# بۆکوێ ئەڕۆی ؟

سروشت تۆراوە ،
لەهەموو لاوە ....
باوو گەرداوە ...
بەم ڕۆژە ، بەم دانە زووە
کێ لەماڵی خۆی دەرچووە ؟
بۆ کوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێرین !

* * *

هەتاکو مەل ،
بێچووی غەزەل ،
بە پەلەپەل ....
هەڵفری لەچیمەنزاری ،
گەڕاوە هێلانەی تاری ....
بۆ کوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێرین !

* * *

قامکی گەرداو
ئەخاتە چاو ...
دوور قاچی خاو ...
دیار ئەخا پووزی گەرم
داپۆشراو بە بەرگی نەرم
بۆ کوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێرین !

* * *

ئەم خانووە ،
قیت و نووە ...
ڕووی لەتووە
بێ بخەوە لەژێر بانی ،
ئەم شەوە تاکو بەیانی
بۆ کوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !
لە گەمبۆڵان ،
لە بای دۆڵان ،
لە چنگ زۆڵان ...
ئەتپارێزی لەشەوەزەنگ
لەدڕندەو گورگی نەهەنگ ...
بۆ کوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !

لێرە خەندان ،
لای ئاگردان ،
تاکو بانگدان ....
لولت ئەدا لەپاڵ سەرم
هەناسەی گیان و جگەرم
بۆ کوی ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !

* * *

ڕەواندز : ١٩٥٧

---

# فیدات بم !

فیدات بم شامەلی باخان ، ئەرێ کام نەونەمامی شەنگ
دلی تۆی ئەنجنی بسۆوەی لەژێ دەی زایەڵەی زارت ؟
لەکام کونجی خەفەت دەرچووی وها ، کام دل ڕەقی بێدەنگ
تەلاری بەرزی تۆێ ڕووخاند ، چی‌یە هۆی ئێش‌و ئازارت ؟
وەکو تۆ خەم لەنێو گیانم خەمی لالە پەرستانە ،
وەکو تۆ نێرگزم ژاکا لەسای ساباتی ڕابردووم
وەکو تۆ هەردەمێ لێرە ، بەرامبەر ئەم گولستانە
ئەگێرم بیبیلەی چاوم بەدووی ئاواتی بابردووم



من‌و تۆ یەك دڵ‌و یەك خوێن ، لەنێو یەك پەیکەرو لەشدا
لەیەك ئەنگوتك‌و یەك پەیکە ، لەیەك ئەندازە خوڵقاوین
لەچنگ گەردوونی نائەموار ، لەڕێگەی سەخت‌و سەرگەشدا
ئەنۆشین ژاری ناکامی ، لەنێو ژانێکی بلقاوین



منیش وەك تۆ ، لە گوشەی نائومێدی ئەشکی چاوم ئەسڕم ،
منیش وەك تۆ نیگاری ئەوجەوانم نێژت لە خاکی ڕەش
منیش وەك تۆ لەناخمدا ـ بەنەسرەوتن ـ هەتا ئەمرم
ئەناڵێنم لەسەر مەرگی تەمەن کورتی نیان‌و گەش



وەرە سەر دوڵکەبێژ بین با لەخۆدەین وەك بریندار ان ،
ئـەتۆ بـۆ بووکی کـوژراوو ئەمن بـۆ یاری نێـژراوم
بگێـرین شێـوەنێکی وا لە گـۆرستـانی نـازداران
ئـەتـۆ لولوی درەوشـاوو ئـەمن مـرواری بێـژراوم

* * *

ئـەگەر قـەل هاتو قیـراندی لەسـەر تـۆپـەنگی لاسـایی
پـەرو بـاڵی لە ڕەنـگ نـا بـۆ ئـەوەی ڕەنگی لە ڕەنگت کـا
نەکەی سڵ کەی لە خوێندن خـاوەنی دەستووری یـاسایی
کـەمێ لۆکە لونێـو گوێت نێ نـەوەك هـێڕ و دەبـەنگت کـا

* * *

نی‌یە کەس تێ بگا ڕازی مرازی ناخی هەڵکەوتووت
وەکو من چونکە من وەك تۆ ڕەوابێژیکی هەڵکەوتووم
دەخۆزگە من نەوایێ بوام لەسازو تاری پێشکەوتووت
بەڵێ نەوساکە ئەمزانی کەمن لەم ژینە پێشکـەوتووم

* * *

ئەزانم ئەم شەوە ئەڕوا ، تروسکەی خۆری ئازادان
بەڕووی ئاسمانی باڵداران بەئاستـەم باڵی کێشـاوە
بەلام کاتی کە ڕۆژ هەڵدێ بەرامبەر پەنجەرەی شادان
ئـەبینی ئێسکی بێدادان لەژێر تیشکی قلێشـاوە !

هەولێر : ١٩٥٨ * * *

---

## چۆن لەبیرت چوو ؟[1]

چۆن لەبیرت چوو کاتی پڕ جۆشم ،
هەیوای دلداریو ژیانی خۆشم ،
چۆن لەبیرت چوو دەنگو خرۆشم ؟
چۆن لەبیرت چوو ؟

* * *

گیانە بە بیرت نایە ڕابردووم ،
تافی جوانیو لاقی بابردووم ..
کە لێت ئەتۆرام ئەهاتیە دووم ؟
چۆن لەبیرت چوو ؟

* * *

چۆن لەبیرت چوو کەچووین بۆسەیران ...
ویستم گەنجەفەت بکەم بە حەیران ،
بەلام چریکەم کەوتە دەم تەیران ؟
چۆن لەبیرت چوو ؟

* * *

چۆن لەبیرت چوو زایەڵەی بالام ،
تۆماری هەستو نەستو سکالام ،
وەستانت لەئاست ئامێزی والام ؟
چۆن لەبیرت چوو ؟

چـۆن لەبـیـرت چـوو تـاکـو ڕۆژئـاوا
دادەنـیـشـین لای نـەمـامـی سـاوا
لەگـەڵ یـەکـتـری وەك بـوكو زاوا ؟
چـۆن لەبـیـرت چـوو ؟

* * *

چـۆن لەبیـرت چـوو لەویـدا لە بـاخ ،
گـفـتو بـەڵێنو پـسـیـارو سـۆراخ ،
نـەخش‌کـردنـی دڵێـکـی بـە داخ ؟
چـۆن لەبـیـرت چـوو ؟
گیـانە تـۆ بی خوا چـۆن لەبیر ئـەکـەی ؟
چـۆن دڵی پاکم لەخـەم گـیر ئـەکـەی ؟
ئـەگـەر وابکـەی سـەرم پـیر ئـەکـەی !
چـۆن لەبـیـرت چـوو ؟
چـەنـد لەبـیر بکـەی من لەبـیر نـاکـەم ،
تـۆمـاری حـەزت جـیربـەجـیر نـاکـەم ،
پـەیـرەوی کـەمو یـاگـزیـر نـاکـەم
چـۆن لەبـیـرت چـوو ؟

* * *

هەولێر : ١٩٥٦

---

(١) چەند کۆپلەیەکی ئەم هەڵبەستەم لەکاتی خۆیدا لەئێستگەی تەلەفزیۆنی عیراقا ـ بەشی کوردی بە گۆرانی‌یەکی دوو قۆڵی (دایلۆج) تۆمار کراوە .

## یارم

یارم بزەی گوڵانە
لەرەی لەرەی چلانە
ژیکەلەی ژیکەلانە
هات و چۆی لە تەڵانە[1]

* * *

سەیرکە نەخشی باڵای
نیگاری ئاڵ و واڵای
چی کاڵایەکە کاڵای ؟
وەک کاڵای پەپولانە

* * *

سەیرکە زولفی خاوی ،
ئەگرێجەی گرێجاوی ،
لە پاڵ مۆژەڵ و چاوی
لە شێوەی سونبوڵانە

* * *

نە ڕۆژی ئاسۆی خاکم
نە ڕووی مانگی ڕووناکم
پاکن ، وەک یاری پاکم
نە ڕەنگی ئەم چلانە

* * *

دیدەی ڕەش و گەوهەری
گەشە وەک دیدەی پەری
هەر ئەڵێی لێوی تەری
گوڵاڵەی جەنگەڵانە ؟

* * *

مەستم ئەکا وەکو مەی
وەکو بۆنی سێو و بەی
دەنگی وەکـو دەنگی نەی
چریکەی بولبولانە

* * *

کە ئەڕوا چوست و چەڵەنگ
وەك شاپەری شوخ و شەنگ
لوتکە ئەڵێتە گزەنگ :ـ
خۆشەویستی مەلانە

* * *

کاتێ وەکو خونکاران ..
ئەوەستێ لای شاکاران
لەترسی ستەمکاران
دڵم لەسەر پەلانە

* * *

# منو ئاوێنە

دوێنێ بەیانی بە بەرگی ڕەشم
وەستام بەرامبەر ئاوێنەی گەشم
لەپێ تا سەرم ڕوانیمە لەشم
تەوێلکی کۆنی گیانی بێغەشم
خۆم دی لەشێوەی لاوێکی ئەوتۆ
دونیا نەدیتەی تەمەن (سی‌ونۆ)
لەناو دوو چاوی بێ فێڵو درۆ
جاڵجاڵۆکەی خەم ئەکا هاتوچۆ
سەرنجی ووردم دایە جەستەکەم
قەپێلکی زەردبووی ناخە پەستەکەم
بە قووڵبوونەوەی بیرو هەستەکەم
تەماشام کردە لەپو دەستەکەم
نەم زانی کێیە ئەم خێر نەدیوە
ئەم قەد چەمیوو گەلا وەریوە
ئەم لۆچە چی‌یە لەڕووی چەقیوە
کوا بزەی کوانێ بۆکێ خزیوە ؟
نەلەسەر لێوی بزەی ڕەونەقدار
خۆی ئەنەخشێنێ وەك گوڵی بۆندار
نە دوو گۆناو دوو چاوی بریندار
ڕۆشنەن وەکو مانگی پرشنگدار
سەیری خۆم ئەکەم بۆر هەڵگڕاوم
خەونە ، یانەکی ڕاستە گۆڕاوم ؟
یاڕووی ئاوێنەی هەڵواسراوم ؟
بێ ڕەنگە یاخۆم لەڕەنگ دراوم ؟

بۆیە نـاناسـم شێوەی نیگـارم
کـە تـۆمـارێکـە بـۆ یـادگـارم
(سی‌ونـۆ) گـوڵی عـومـری ژەنـگـارم
وەریـن ، ئـەوەی خـەمـی بـیـگـارم
ئـەختێ زیاتـر لە ئـاوێنـەی شـەنـگ
نـزیـك بـوومـەوە بـە دڵی بـێ ژەنـگ
دیم لە ئـاوقـژی ڕەش وەك شـەوەزەنـگ
چـەنـد داوی سپی وەك داوی گـەزەنـگ
هـەروا لەنـێـو ئـەم سـمـێـلە زەردەم
داوێـکـی سـپـی هـاتـە بـەر دیـدەم
کـە دیم بـوو بـەشـەو ڕۆژی گـەڕیـدەم
ئـاوێـنـەم بـوو بـە گـوێ‌و چـاوو دەم
لێم پرسی : کوانی بێچووی حەوت ساڵان ؟
ئـەوەی هەڵچـووبـوو ، وەکـو گـوڵاڵان ؟
کـوا ئـەو مـنـاڵەی لە بـاخ‌و یـاڵان[1]
چـاوکێلکـێ‌ی ئـەکـرد لەگـەڵ منـاڵان
کـوانـێ ژیـکـەڵەی نـەرم وەك پـەمـۆ
وەکـو ئـاوریـشم‌و مـێخـەك‌و شـەوبـۆ
وەکـو هـەتـاوی دەمـەو نـیـوەڕۆ
ئـەدرەوشـایـەوە لە ئـامـێـزی تـۆ ؟
بـۆ کـام دوورگـەی وون تێ هـەڵدراوە ؟
بـۆکـام بـیـابـانـێ ڕاپـێـچ کـراوە ؟
بـۆکـام کـیـشـوەرێ تـەفـرە دراوە ؟
کـوانێ ؟ لەکـوێـیـە ؟ بـۆ دوورخـراوە ؟
ئـایـە ئـەویش وەك ڕاژیـلەی یـارم
کـۆچـی کـرد ڕۆیـی ، لەمـێرخـوزارم
کـوا شـاپـەریم ؟ کـواسـروشی تـارم ؟

کـوا لاویـەتیم ؟ کـوا تـاق بـەهـارم ؟
کوا کاڵتـەو گەمـەم ؟ کوا هـەرزەکاریم ؟
ڕێی بەهرەمـەندیو جێی جـوانکاریم ؟
کـواهەستی مـەستم ؟ کوانێ شـاکاریم ؟
کـوانێ ئەنـدێشەم ؟ کـوا ووردەکـاریم ؟
وەڵامـێ نـەبـوو لەدەم ئـاوێـنـە
بـەڵام چـرپـەیـێ لەزاری وێـنـە
دای لەگـوێـم ووتی : خـەم مـەڕوێـنـە
ئـەو ڕۆڵی ئـێسـتـای ئـەمـڕۆ ببـێـنـە
هـەر ئـاوا ئـەمـەش نـامـێـنـێـتـەوە
ئـەخـزێو ئـیـنـجـا پـیـری دێـتـەوە
ئـەمـیش نـامـیـنـێو ئـەڕزێـتـەوە
وەك گـیـا ئـەژێو ئـەژاکـێـتـەوە !

هەولێر : ١٩٧٠

---

(١) یاڵ : بەرزایی تەسك و درێژی شاخ

# چاوەڕوانی

تا ماوم هەر خۆشم ئەوێ ،
یادی لە سینەم ئەخەوێ
دڵم لێ ئەدا بۆ دڵی
بەیانی تا نیوەشەوێ
چۆن لەبەر چاوم وون بووە
نیگاری پەرچەم پرتەوێ ؟
کێ دووری خستەوە لەمن ؟
کێ لێرە لای‌برد بۆ ئەوێ ؟
دوێنێ لەلام‌بوو ، لێرەدا
ئەمڕۆ لەلای نیمە لەوێ ...
لەیادی چوومە تاوەکو
نایەمە یادی لە خەوێ
منم هۆگری ئا منم
چۆن بێ هۆگری ئەسرەوێ ؟
کێ ناوی هێناوم لەلای
بە خەوشی تاکو سەرکەوێ ؟
نەخێر چ سوچێکم نییە
گەر هەیە با بۆم دەرکەوێ
لەهەر کەسێ پیرۆزترم
لەهەر کۆن‌و لەهەر نەوێ
خۆی منی هەڵبژارد ، منیش
پڕم‌دا ڕیشمەو جڵەوێ
خۆی منی خستە داوی خۆی
بەگفت‌و مەرج‌و گرەوێ

ئەمە نامەکەی ، ئەمەتا
بتەوێ یاخود نەتەوێ
ئەمەیش نیگاری ئیمەنی
ئەیدزی گەر بۆی هەڵکەوێ
لەوێ کێشاومانە لەوێ
لەزنجی بەر زیخو چەوێ
ئەوەستم لێرە ، تاوەکو
دێتە گوێم دەنگێ لەدەوێ
ئەڵێ : ئەی ڕاوکەرم وەرە
ڕاوم نێ بۆ ئێرەو ئەوێ
سەیرکە کامەیان چەلە
ڕاوی یار ، یان ڕاوی کەوێ ؟
بیکە بە بەزمو گەنجەفە
لەرك هەر ساواو قەڵەوێ
بێجگە لەتۆ بۆ کەس نییە
شەکراوی گۆنا بتەوێ
کۆلیتی تەنگو تاری تۆ
نادەمە کۆشکی خەسرەوێ !

هەولێر : ١٩٥٥

## گوڵ

گوڵ لەباخان چەند نزمبێ نیشتەجێی هەردەم گوڵە
دڕکی زوڵیش دڕکە گەرچی نیشتەجێی پۆپەی چڵە
گەر هەزار ساڵی ڕەبەق زاڵ بێ بەسەر باخی گوڵان
نایەتە ڕیزی ئەوان ئەو ، چونکە بێ خەندەی گوڵە



## زێڕ

زێڕ ئەگەر هاڕا بەبەرد ، نابێتە گڵ هەر زێڕە زێڕ
بەرد نرخدار نابێ ، ئاواش زێڕ چی کەم ناکا نەخێر
چونکە بەرد زۆرە لەبەر چاو ، بۆیە وا نرخی کەمە
هەر شتێ زۆر بێ‌وەها ، ناگاتە ڕادەی دڕو زێڕ



## ناحەز

گەر دەمی ناحەز نەبێ زانستیار نایەتە ڕوو
شەوەزەنگ باڵی نەکێشێ ، کێ ئەبینێ مانگی نوو
قاوەی بۆندار بۆنی نایە گەر لەتەك ئاگر نەبێ
هەر وەها گەر دەمی ناحەز نەبێ حەز نایە تەڕوو



## دڵ

دڵ ئەگەر کینی لەناوبێ ، چۆن ئەبێتە جێی هونەر ؟
(تۆ) ئەگەر کرمی لەناوبێ ، بیچنی نایە تەبەر !
تۆ ئەگەر خۆت شەو بی چۆن ئاسۆی وولاتم گەش ئەکەی ؟
تۆئەگەر خۆت کوێر بی چۆن فێرم ئەکەی نەخشی هونەر ؟

* * *

## پەنجە

پەنجە بۆچاندنی گوڵ خولقاوە ، نەك چاندنی خار
وەکو خۆر بۆچاکە هەڵدێ ، تاکو لادا شەوی تار
پەنجەیێ خونچەی ئومیدی دڵو گیانانی ڕنی
بێگومان خونچەی ئومێدی خۆی ئەژاکێ وەکوخار ؟

* * *

هەولێر : ١٩٥٦

# وەك من

ئەی شای دڵداران ، ئەی (مەم) خەبەرێ
وەك من ئازارت دی لە دڵبەرێ ؟
وەك من ئاوزینگی دڵدارانت دی ؟
دڵۆپی ئەشكی زامدارانت دی ؟
برینی دیدەی بێدارانت دی ؟
لەگفت دەرچوونی نازدارانت دی ؟
باڵی شكاوی باڵدارانت دی ؟
گوناهی گەورەی زۆردارانت دی ؟
وەك من بیانوێ كۆڵدارانت دی ؟
كەلەپچەو زیللەی جاندارانت دی ؟
ئەی شای دڵداران ، ئەی (مەم) خەبەرێ ؟
وەك من ئازارت دی لە دڵبەرێ ؟

*

برۆ بپرسە لە ڕەونەقداران
چەند لە سەماگای پۆلی نازداران
تارم ژەنیوە وەك بەهرەداران
نۆتەم لێداوە بۆ پرشنگداران
لەسەر ڕایەخی ژێر سایەداران
ڕاستە تاجداری لەنێو تاجداران
بەلام ئەمنیش ئەی شای دڵداران
ناودارم وەك تۆ لەنێو ناوداران
. ئەی شای دڵداران ، ئەی مەم خەبەرێ
وەك من ئازارت دی لە دڵبەرێ ؟

*

ئەی لەخۆبایی کەمێ لەسەرخۆ
شانازیت نەیە بەگوڵی بێبۆ
دارێکی ڕەق بوو داری حەزی تۆ
بڕۆ بپرسە لەتەڵی شەوبۆ
لەپەڕی گوڵی نێرگزو هێرۆ
کام باڵندەیێ بەخۆری ئاسۆ
شاپەڕی سووتاو بووە ژیلەمۆ ؟
ئەتۆ یانەخۆ ئەمنی ڕەنجەرۆ ؟
ئەی شای دڵداران ، ئەی (مەم) خەبەرێ
وەك من ئازات دی لە دڵبەرێ ؟



هێندە هەڵمەڵی بە «زین»ی باڵات
بە ڕەنگاوڕەنگو بە ئاڵو واڵات
بەسیەتی ، لادە ڕازو سکاڵات
هەتاکەی ئەژی وا بێ موباڵات
چاوت هەڵێنە سەیرکە کاڵات
بە یەکتر ناچن ئاڵاو ئاڵات
تروسکەی لالاو تروسکەی لالات
شایەستەی کێیە تاجی خەیاڵات ؟
بەتۆ یا بەمن ئەی «مەم» خەبەرێ
وەك من ئازارت دی لەدڵبەرێ ؟

زاخۆ : ١٩٥٥

## دوو بادە[1]

دوو بادەم نۆشی : یەکێکیان شادی ،
یەکێکیان عەزاب
بەڕازی برسی و تینوی نیهادی ،
بەسازو ڕەباب
وەستا لەپێشم بە کۆنە یادی ،
شۆخی ڕوو ئافتاب ..
لەدەستێکی بەی
لە ئەوێدی قاب
پێی وتم : فەرموو ،
بنۆشە شەراب !

*

لەتەلی گوێی دام وەکو دەنگی نەی ،
کاری کرد لەگیان
ناو سینەم پڕ بوو لەبۆنی مەمەی ،
لەتەندی نیان
ووزەم لێ بڕا ، چی ڕازێ بوو ، وەی !
چی جادووی ژیان ..
منی خستە نێو
دۆزەخی زیان
دوارۆژمی هێشت
بێ تاسەو ڤیان !



چاو ئاشکرای کرد نهێنیی نێو دڵ ،
جولایەوە زار
ئێشی نوقرچو دیاری چەپکە گوڵ ،
پێکەنینی پار
خەون نەخشاندی بێ کلچێوکو کل ..
دوو دیدەی خومار ..
نقوم بوونە نێو
ئاواتی ساکار
هیوای تێپەڕبووی
هی پارو پێرار !



لەدوای نیگاری بەهاری وون بووی ،
نیگاری خەزان
هاتە بەرِاوی کزو خەواڵووی ،
وتی : ئەی نەزان
لای بەهار چۆن بووی لای منیش ئەوڕووی
هەرزانی هەرزان
سەرەڕای ئەمەش
وەك گەلای ڕەزان
ئەوەری لەچنگ
زستانی زۆرزان !



قـاقـای تـێکـەڵاو بـە داخـی گـەرم ،
لەنێو سەماگا
دەنـگی دایـەوە هـەر ئـاواش شـەرم ،
فڕی لە نیگا
پـاشـان بـەخـەنـدەی نـیـان و نـەرم
ڕووی کردە دەرگا
سـەری نـایـە سـەر
سینەی زامدارم
وتـی : بـۆ تـۆبـێ
هانی د یدارم !



هەولێر : ١٩٥٩

---

(١) لە عەرەبی‌یەوە :خیر الدین الزرکلی

# دەمت لابە

دەمت لابە لەبەر دەمم
چیتر نایخەمە ناو دەمم
هەنگوین و قەندو شەککەری
نابن بە پێخۆری ژەمم
زویرم لەو چەشەی کەوا
تاڵە وەکو چەشەی خەمم
بەسیەتی ناڵە، با لەوێ
بخەوێ لای مژو تەمم
بەیادی کاتی ڕابردوم،
بەیادی ساڵی سێیەمم
دەبا بسێتەوە دڵم
لێرە لەسیلەی ماتەمم
هەر لەبەر تۆیە من کەوا
لەسەر زاری ئەوو ئەمم
هەوارگەم بەردە دوورکەوە
لە ڕێژگەی ڕووبارو چەمم
خۆم خاوەنی هەواری خۆم
خۆم خاوەنی بانیژەمم
هەر خۆم پەرستگەی حەزی خۆم
خۆم کرنۆش بەر، خۆم سەنەمم
سەردەمێ ئەموت : دەمە
کوانێ لەکوێ ما سەردەمم ؟
بەلەمی هیوام لەسەر زێی
حەزت بوو، ئەما بەلەمم

مەلی «دێوانە»ی ، نا نەخێر
«شەمم» کوژاوە ، کوا «شەمم» ؟
ناوبانگی وا درۆم ناوێ
نا ، با نەبێتە بەرهەمم
نا ، با نەبێتە هۆگرم
نا ، با نەبێتە هاودەمم
چیت ئەوێ بۆ گەڕایتەوە
بەرەو چوارپایەی سیسەمم ؟
لەپڕێکەوە ، هەر وەکو
دیداری جاری یەکەمم
چیت ئەوێ ئاخۆ چیت دیوە
لەنێو کەلاوەی ستەمم ؟
ئەمن ئێستاکە پەیکەرم ،
ئەمن ئێستاکە عەدەمم
تەمەنم ڕۆیی تەمەنم ،
زۆرم تێپەڕی ما کەمم
چیتئەوێ ؟ چەچە ؟ نابەخوا
نەماوە چەچەی ساغڵەمم
باڵم شکاوە شاپەڕم
وەریوە تێنوی تاسەمم
نەهەست ، نەئەندێشە نەنەی
ماوە ، نەچرپەی قەڵەمم
نەتۆ «شیرین» نەمن «فەرهاد»
نەتۆ «زین»ی نەمن «مەمم»
چیت ئەوێ ؟ بەهرە ؟ چی ئەڵێی
گەرووتمتۆپی بێ پەمم ؟ !

نــازت مــەرپێســە ، کــۆی کــەوە ،
نــازت نــابــێــتــە مــەرهــەمــم
زوێــرم لەتــاســەی کــزم ،
لەخــرپــەی وا بــەئــاســتــەمــم
ســوێــنــدم خــواردووە لەمــەولا
نــەتــکــەمــە زاخــی نــەغــەمــم
بــڕۆ مــەوەســتــە ئــەگــیــنــا
دێــتــە جــێی ســوێــنــدو قــەســەمــم
گــەر تــۆ کــچــی دایــە «حــەوا»ی
مــن کــوڕی بــاوە «ئــادەمــم» !

هەولێر : ١٩٥٧

# لێی پرسیم

کچۆڵەی شەنگی نێوان کچۆڵان ،
دیدە قەشەنگی نێو نەرمو نۆڵان
دوێنێ لێی پرسیم : کێیە هامڕازت ؟
کێیە دڵخوازت لەگوڕجو گۆڵان ؟
کێیە ئەو شۆخەی بەبەژنو باڵای
هەڵدەلێی وەکو شێتو شپۆلان ؟
وەڵامم داوە : لەتۆ زیاتر
کێیە بووکۆڵەم لەنێو بووکۆڵان ؟
بێ لەتۆ کێیە دڵدزی باڵام ،
کێیە ئاسکۆڵەم لەنێو ئاسکۆڵان ؟
تۆ دڵارمو هیوامی هەر تۆی
چاوگەی ئومێدی شامەلی دۆڵان
تاکو باوەڕکەی فەرموو بپرسە
لە جوانەکانی چیای سەهۆڵان
لە پەرییەکانی بەهەشتی یەزدان
لە زەرییەکانی دەریای شەپۆلان
بپرسەلەوان ، ئەوان ئەزانن
بپرسە لەوان لەتوندو تۆڵان

گوێ بدە قسەی پاكو پیرۆزان ،
گوێ مەدە قسەی سەگو گەمبۆڵان
با بەخیل بۆ خۆی بۆڵەبۆڵی بێ
گوێی خۆت كەربكە لە بۆڵە بۆڵان
دڵێ من بێ تۆ گاشە بەردێكی
ڕەقە ، لەشێوەی بەردی تەپۆڵان
بێتو نەتبینم ساتێ لە ژینم
شاران ئەپێووم كۆڵان بە كۆڵان
ئەڵێم : ئێ بەڵكو وێنەت ئەبینم
لەوێدا لەنێو پۆلی كچۆڵان
گەر تۆم بۆ نەبێ لەم جیهانەدا
وەكو «مەم» ی «زین» ئەكەومە چۆڵان

تۆ زۆر قەشەنگی لەتۆ قەشەنگتر
نەبووەو نابێ لەنێو كیژۆڵان
بەئەندێشەی تۆ هێنامە لەرزین
ئەو دڵانەی كە ئاسن وپۆڵان
پێنووسم ئەوەی لە تەنهایی‌دا
كە پێی ئەنووسم وتەی پیتۆڵان
بێتو جیابێ لە دیمەنی تۆ
ئەهاڕێ لەژێر قوندەرەو سۆڵان
چونكە باڵای تۆم هەر لەبەر چاوە
بۆیە وا بوومە ژانی ماخۆڵان[1]
وەرە ، تۆ وەك گوڵ من وەكو بولبول
دا نشین لەئاست پەرچەم گڵۆڵان
لێرە مەی ، لەوێ ئاهەنگی شادی ،
لێرە نەی ، لەوێ دەنگی دەهۆڵان

کە ئەمانەی بیست شۆڕە کچی شۆخ
لە شاعیرەکەی لاتو کڵۆڵان
وتی : تاسەکەت ئەوەی ئەیڕێژی
تاسەی مێرانە نەك تاسەی زۆڵان
شوو بەکەس ناکەم گەر بەتۆ نەبێ
گوڵ بۆ بولبولە ، نەك بۆ ڕیشۆڵان

هەولێر : ١٩٥٥

---

(١) ماخۆڵان : معاناة

# بۆ ڕەخنەگرێك

[ڕەخنەگرتن لەشیعر ئەبێ تەنیا هەر لە لایەن شاعیر بێت]

کاکە بەس هێرش بەرە سەر هەستم
بەس بشکێنەوە شێوەی هەڵبەستم
بەس بڵێ : تەنیا جوانکارییە
بێ داهێنانو بێشاکارییە
تەنیا چەند ووشەی نەرمو نیانە
بێ خوێنو ڕەگو دەمارو گیانە
تەنیا ڕوخسارو زەنگو وێنەیە ،
بۆناپەسندی وەك ئاوێنەیە !
تەنیا هۆنراوەی دەمو دەورێکە
خۆی ناگریو ئەڕواو پەڵە هەورێکە
شاعیری کاتی شیعری سادەیە
خەریکی بەیو مەیو بادەیە !
کوا سازی ؟ کوانێ کەمانو تەلی ؟
لەتەپو تۆزی شۆڕشی گەلی ؟
کوا پەپولەی ؟ کوا هەنگی قەشەنگی ؟
کوا گەڵای ؟ کوانێ گوڵی ڕەنگ ڕەنگی ؟
کوا عەنبەری ؟ کوا میسكو گوڵاوی ؟
کوا بزەی ؟ کوانێ تیشکی هەلاوی ؟
ئەوەی دایناوە هەر قسەی رووتە
نەك ـ وەکوئەڵێ ـ دوڕو یاقووتە
تو خوا ئەی ڕەخنەگری بازاری
ئەی ئەوەی گۆشتم ئەخاتەزاری :

ئەمە ڕەخنەیە یا کینی ڕەشە
ئەیڕێژیە سەر ئەم شیعرە گەشە ؟
سینەی ڕۆژنامان پڕ ئەکەی لە کین
بەناوی ڕەخنەی زەردو سپی و شین
گەر ڕەخنەگری نرخشوناسم
بەڕۆکم بەردەو بەس بکە باسم
بەس بەخیلی بە بە نووسینەوەم
بە داهێنان و بە هۆنینەوەم
بەسەرو سیمای ووشەی باڵدارم
ئەمن هێشتاکە چریکەدارم !
هێشتاکە مەلی باخی بەهەشتم
خاوەنی تەختو تاراج و گەشتم

هێشتا گوێندەی ئەم کوردستانەم
فرندەی ئاسۆی ئەم دارستانەم
وینەگری ڕووی ئەم خۆڵو خاکەم
خەفەت هەڵگری ئەم دایکە چاکەم !
هێشتاکە تاسەم هەنگوینی هەنگە
دەروونم ماوەی بەزمو ئاهەنگە
هێشتا خاوەنی کێش و لەنگەرم
هەناسەم گوڕەو زایەڵەم گەرم
هێشتا سیمفۆنیم ئاڵو والایە
پێکی دووزەڵەم پڕ سکالایە
هێشتاکە بەهرەم وەکو شەوچرا
ئەدرەوشێتەوە ئەگەر هەڵکرا
هێشتا ئەندێشەم تریفەدارە
سەرچاوەی پڕ لە شیعری بۆندارە

هێشتاکە ڕەوتم هەر بەرەو پێشە
دیمەنی تابلۆم سەرنج ڕاکێشە
هێشتا پەپولەی خنجو پەروانەم
کڕنۆش ئەبەن بۆ مۆمو خەرمانەم
هێشتاکە ئەسپی هونەر جڵەوی
لەدەستی منە تۆ هەر لە خەوی
سەرەڕای ئەوەش نیگاری گەلم
نەخشاوە لەنێو دەروونی تەلم

تەلم ڕابەری پێشکەوتن خوازە
هەر ئاوازێکی هەزار ئاوازە
خاوەنی بڕواو ڕێو پێ و جێگەمە
ڕێگەی ئازادی خوازان ڕێگەمە
بێجگە لەمانەش گڕی ئەشکەنجەم
بوتە پەژارەی قەمیشی پەنجەم
گوڕ ، گوڕ دێتە خوار لەزامی ئاڵم
ئەبێتە مایەی وورده خەیاڵم

خەیاڵم باخچەی هەستو هونەرە
بۆیە ڕەخنەکەت تیغو نەشتەرە
باوەڕیم بەخۆم هەیە کە باڵام
کاسێتی ئاخو داخو سکاڵام
باوەڕیم بەخۆم هەیە کە سازم
بۆ بەهرەمەندان چاوگەی نیازم
وەکو ئاوازی نەی دڵارامان
وایە گۆرانیم بۆ گوڵەندامان

تۆ چیتە لە نەی ، لە ناڵەی ژەنەی
نەیژەن تێ ئەگا لە دەردەنگی نەی !
من خۆم ئەزانم کەمەل ئەخوێنێ ؟
بەچۆن شێوازێك گوڵ ئەلاوێنێ ؟
تۆ هێشتا کاڵی وەکو فەریکی
وەکو دووزەڵەی بێدەوو پیکی
دووزەڵەی بێپیك چۆن ئەفیکێنێ ؟
چۆن هەستو نەستی خۆی ئەدرکێنێ ؟

تیر تیژکراوە بۆ تیرهاوێژان
گۆرانیش هەر بۆ گۆرانی بێژان !
گۆشت بۆ قەسابو نان بۆ ناناوا
پەندێکی کۆنەو تائێستاش ماوە
شیعری من ئەژیو شیعری تۆ ئەمرێ
بێژینگ ناتوانێ بەری ڕۆژ بگرێ
ئەو کاتەی کەمن لەزەماوەندان
تارم ئەژەنی بۆ هونەرمەندان
چریکەم ئەهات لەگەڵ باڵداران
ئەم هێنا لەرزین دڵی زۆرداران

ئەو کاتەی کەمن لەگەڵ ئازادان
ئەوەستام لەڕووی چینی بێدادان
ئەتۆ هێشتاکە لەشێوەی جوجەڵ
کاکۆڵەت ئەکرد لەسەر قاچو پەل
پڕپۆلەت ئەخوارد لەبەر دەستی من
چۆن ڕەخنە ئەگری لەهەڵبەستی من ؟

تۆ قەلی قیژەقیژو قرپیوەی
کیندار دژی چرپەو چریوەی
قەل نابێ ڕەخنە بگرێ لەبولبول
لەسای چقڵ بێ یا لە سای سونبوڵ
قەل پایەی هەر چەند بەرز بێ قەلە
بولبولیش بولبول جوانترین مەلە !

بەغدا : ١٩٧٣

## بەهەشتی خەو

هەولێر : ١٩٦٠

ژیکەڵەی شەنگی نەوجەوان
کە چاو لێك ئەنێم بە شەوان
گوێم لێیە لە خەونی خەوان
ئەڵێتە پەرچەم پرتەوان
ئەژیم لێرە لەسای چڵان
لەلای گەڵای داری گوڵان
لەگەڵ چریکەی بولبولان
دێمە دیاری باخەوان
دێمە کەیفگەی پەرییان
بەزمگەی شۆخە زەرییان[1]
بۆ یاخەو تاجی سەریان
ئەڕنم گوڵی ئەرخەوان
لەبانیژەی دیدەگەشان
لەکۆنگەرەی زوڵف ڕەشان
لەناو تەلاری بێغەشان ...
دائەنیشم لەگەڵ ئەوان
کەبزەی سەر لێوم فڕی
ئەوسا بەچوستی شاپەری
دێ ، لەپێشم هەڵئەپەڕی
لەسەر ئاوازێکی ڕەوان
لەدوای ئاهەنگی سازو نەی
ڕائەکشێم لەسای داری بەی
خەونی خۆشخۆش ئەبینم وەی
چی خۆشە خەونەکەی خەوان ؟

لەگەڵ هەڵهاتنی گەزەنگ
ئەبەستم چەپکێکی قەشەنگ
ئەڵێم بەیاوەری چەڵەنگ
بڕۆ بەشیکە سەر کەوان
کەوم لەنێو شەوی خەمە
بێ تەلانو باخو چەمە(2)
هەر چەند بناڵێنێ کەمە
بۆ منی کۆکی نەوجەوان
چەند بە گوشادیو دڵنیا
لەدامێنی کەژو چیا
لەگەڵ تاسەی دڵم ژیا
بەیانی تا نیوە شەوان
ئەسووتا وەك پەڕەنگی گەش
وەك دروشم وجەڤەنگی بەش
لەکوێ ما ؟ کوانێ ڕەنگی لەش ؟
لەکوێ ما خەندەی سەردەوان
شکۆفەی شەوچراخی من
ڕۆیی ، ئەما لە باخی من
گوێ بدە ئاخو داخی من
گوێ مەدە ئاوازی قەوان
چریکەی دمکی ئەم مەلە
نەوای بەتامی ئەم تەلە
زرینگەی زەنگی ئەم گەلە
لەمن دزراوە نەك لەوان !

(١) زەری : زەریاکچ
(٢) تەلان : لەناوەندی دوو ڕێزە درەختا کۆڵانێکی درێژ
(٣) پەڕەنگ : پشکۆ

# پەپولەی مردوو

چی لێ قەوماوە، پەپولەی جاران
پەرندەی شەنگی گوڵشەنی یاران ؟
چی لێ قەوماوە ؛ بۆ لەدەوری گوڵ
ناسوڕێتەوە وەك هەستیاران ؟
بۆچی وەك دوێنێ لەم چڵ بۆ ئەو چڵ
نایەت و ناچێ چەشنی شاکاران ؟
بۆچی وەك پێشوو نایەتە لەرزین ؟
کوانێ لەرزینی لەئاست نیگاران ؟
کوا زەماوەندی ؟ کوانێ گۆڤەندی ؟
کوانێ مەڵبەندی لە نێرگزجاڕان ؟
بۆ لەسەر ڕێگا وا فڕێدراوە ؟
بۆ ڕاکشاوە دوور لە نیساران ؟
بۆ لەبەر نیگام وا گەراقوپە ؟
بۆ نقوم بوویتە دەریای چەخاران ؟
ئایا لەبەر یار ؟ یا کۆچی بەهار ؟
یا ماڵئاوایی گوڵی تەلاران ؟
یا نقوم بوویتە ناو خەونی خۆشی
تا بسێتەوە وەك بەختیاران ؟
یاخود لەڕاوکەر ئەترسیّو لەپڕ
ڕاویکاو بێبا بۆ ستەم کاران ؟
سەرنجی بدێ چۆن نیگارێکە ؟
چۆن گوزارێکە لەناو گوزاران ؟

خولقاوە تاکو وەك قەرالیچە
حوکمداریێ بێ لە مێرخوزاران ؟
فەرمان بگێڕێ بەسەر ئەمو ئەو
بەسەر مەلانو گوڵی گوڵزاران
پەرستگای وەك من لەم بەهەشتەدا
چەسپاوە لێرە ، لەلای جوانکاران
وەك منی شەوگار لەدەورەی چرا
سوڕاوەتەوە ، لەگەڵ شەوگاران
ڕەنجێکی زۆری لەگەڵ عیشقی خۆی
داوە ، وەکو من ، وەکو هەزاران
ئەمە لەشیەتی ، لەشی نەرمینی
نەرمە وەك مێرگی تافی بەهاران
ئەمەش چاویەتی ، ئەمەش شاپەڕی
ڕازاوەتەوە وەك لالەزاران
وەك گوڵەندامی خەڵقەندەی خوایی ،
وەك دلارامی پۆلی هوزاران
کە ئاوام بینی بەم پەژاریی‌یە
تەزووم کەوتە ناو ڕەگو دەماران
نەختێ زیاتر چوومە سەر سەری
وەکو پشیلەی پەنای دیواران
پەنجەم درێژکرد زۆر بە ئاسپایی
هێدی تا نەفڕێ بەرەو هەواران
خستمە چنگم وەك چۆن بەختەوەر
ئەخاتە چنگی دوڕی خونکاران
سەرنجم دایە کەلێ بەووردی

دیم گوڵە نەوەك پەپولەی جاران
ئەوسا تێر گریام تا لەتێن کەوتم
چەند خۆشە گریان بۆ خەفەتباران !
وتم : باخەوان کاتێ ئەخەوێ
ئاگای نامێنێ لە گوناهباران
لالەی ئەڕنن لەدوای ڕنینی
فڕێی ئەدەنە سەر ڕێی ڕێبواران
یاسای ئەم چەرخە چی یاسایەکە ؟
یاسای ژیرانە یا یاسای خواران ؟
چقڵ بۆزاناو داناو هەستیار ،
گوڵ بۆ نەزانو دەبەنگو لاران !

شەقلاوە : ١٩٥٨

# پەشیمانی

دوێنێ : پێی وتم : من لەنێو خەمم ،
من پەشیمانم ! من لەنێو تەمم
من ئێستا لێرە بەبێ هۆگرم ،
من ئێستا لێرە بەبێ هاودەمم
بەخیل بوو ئەوەی تۆی خستە ئازار ،
تۆی بەستەوە بە گوریسی خەمم
گەر باوەڕ ناکەی فەرموو بپرسە
لە ئەشکی زۆرو لە خەوی کەمم
پێم وت : دەی بڕۆ نەگەڕێیتەوە
بۆ ئێرە ، نەکەی بێیتەوە چەمم
نەکەی پێم بڵێی : هەر یارەکەی تۆم ،
هەر لەسەر گفتی خۆم و قسەمم
تۆ «مەم»ی ئەمن «زین»ی بالای تۆم ،
تۆ «وەلی» ئەمن بۆ شەوت «شەمم»
من تۆم ناسیوە ، زانیومە تۆ چیت ؟
چیت ناوەتە نێو بادەی بەردەمم
من تێر بووم لەمە ، لەم تالاوی‌یە ،
چیتر لەمەولا نابێتە ژەمم
مەلێ بەهەرەکەت کوانێ لەکوێ‌ما ؟
بەهرە نەماوە لەزیل و بەمم[1]
سەیرکە ناخی گۆزەم بەتاڵە
نە جورعەی زۆرم ماوە نە کەمم[2]
درۆت مەڕێژە نێو گوێم دەمێکە
درۆت ناکەمە زاخی نەغەمم

نە تۆ وەك جاران «زین»ەكەی دڵمی ،
نە من وەك جاران بۆ دڵت «مەم»
تۆ لەحەز ناكەی هێشتا كە زاڕۆی ،
ڕەوای تۆ نی‌یە حەزی مەردەم
من ڕاستم بڕوام بە ڕاستی هەیە
لەسەر زێی ڕاستی ئەڕوا بەلەم
من گەوهەری خۆم نادەم بە خەڵوز
گەر بێت و بیدەم كەمتر لە كەم
لەخۆشەویستی چاوگەی ئایینم
نمونەی گەنجی چەرخی بیستەم
مەڵێ : نیشانەت هێشتاكە ماوە
لێرە ، لە تەڵی قژو پەرچەم
سوژدەگام ئەتۆی ، ئەتۆی پەیكەرم ،
ئەتۆی بتخانەی بت و سەنەم
نەخێر بڕوای تۆ ڕاست نی‌یە گیانە
خوارە هەر وەكو لاقی سیسەم
مەڵێ خاوێنم وەك گوڵی یانە ،
پاكژم نەوەك پیس و ستەم
ڕۆشەنم وەكو تیشكی مانگی پڕ
پیرۆزم وەكو گیانی «مەریەم»[٣]
ئەو شۆخەی كەوا دوێنێ ئاوا بوو
ئەمڕۆ وا نی‌یە لەنێو بەرهەم
بسڕەوە ئەشكی چاوی فێڵاویت ،
فێڵە نابێتە هیچ و مەرهەم
نەتۆ یار ، نەمن تازە لاوی تۆم
نەتۆ «لەیل» نەمن «قەیس»ی دووەم

دەمێ ڕەنجمدا لەپێناوی تۆ
بەفیڕۆ ڕۆیی ڕەنجی ئەو دەمم
تاکوو بڕواکەی فەرموو ، بخوێنە
نامەی یەکەمو نامەی سێیەمم
تۆمارم ئەوەی ئەڵێ : فیغانم !
نیگارم ئەوەی ئەڵێ : ماتەمم !
یاداشتی حەزی دڵێکی کۆنم
ڕووگەی سەرنجی هی ئەوو ئەمم
هەموو چرایە بۆ وەفاداری
ووشەی بەتامی نوکی قەڵەمم

هەولێر : ١٩٥٦

---

(١) زیلو بەم : دووچەشنە مۆسیقای ڕۆژهەڵاتین .
(٢) جورعە : قوم .
(٣) مەریەم : دایکی پیرۆزی «مسیح»ە .

# هەڵکەوت[1]

دوێـنـێ ئـێـوارێ یـاری قـەشـەنـگـم
لەپـڕێـکـەوە هـاتـە بـەر چـەنـگـم
کـاتـێ کـە تـیـری دا لە هـەنـاوم
دام لە هـەنـاوی تـیـرو خـەدەنـگـم
غـاری‌دا ، مـنـیش غـارم‌دا بـە دوای
زەویـمـان لول‌دا مـن و قـەشـەنـگـم
وتـی : وازبێـنـە . وتـم : چـۆن ئـەبێ
لەکیس دەم ڕاوی ئـاسکـی چـەڵەنـگـم ؟
وتی : ئـەی پـەری شـەنگی بـەهـەشتم
ئـەی زەری مـەنـگی بـاخـی بێ ژەنـگـم
ئـەی سـەرو چـاوەی هـەوێـنـی شـادی
بـۆ بـیـری پـاك‌و تـاسـەی بـە پـەنـگـم
چـۆن نـازانـی چـیـم ئـەوێ لەڕەنـگـت ؟
چـۆن تـێ‌نـاگـەی لە دەردەنـگـی زەنـگـم
شـتـێـکـم ئـەوێ گـەر پـێـم بـبـەخشی
پـەریـان پـۆل پـۆل دێـنـە ئـاهـەنـگـم
مـاچـێ لەگـۆنـات ، ئـەویـتـر لەدەم ،
یـەك لە گـوڵاڵەم ، یـەك لەلالەنـگـم
بـۆیـە لەدەوروبـەری خـەرمـانـەت
وەکـو پـەروانـە گـێـژو دەبـەنـگـم
کـە ئەم ئـارەزوو و خـواست‌و ویستـەی بیست
لە دەمـی بـەبـێ قـفـڵ‌و خـەپـەنـگـم

دەم و دەست تەری بەرەو ئاوایی
وەی لەتەرینی فریشتەی شەنگم ؟
ویستم ماچی کەم لە لێوی قوتوی
تۆزێ بنۆشم هەنگوینی هەنگم
بەلام نەمتوانی بە ئامانج بگەم
لەبەر ناوەختی و کاتی درەنگم
چی ئەبوو ئەگەر بمژیبوایە
شیلەی بەتامی دیدە گەزەنگم
بێجگە لە ڕەخنەی پۆلی دلداران
لە ڕەوشتەکەی خاوێن‌و مەنگم
برایان دلم مەدەن بە هەرزان
من بە دل دژی کردەوەی نەنگم
گەر لەسەنگم دەن بەسەنگێکی ڕاست
لاتان ڕوون ئەبێ قورساتی سەنگم
ئەوین‌و جوانی بوون لەگەل بوونم
وەهاش ئەنێژرێن لە گۆڕی تەنگم

---

(١) بنەڕەتی بیری ئەم شیعرەم لە شیعرێکی عەرەبی کۆن وەرگرتوە .
(عمرو بن ابی ربیعة)

# جادووگەر

لادەن لە چاوی وا جادووگەری
کەس ڕانەوەستێ لە بەرامبەری
نەکەن باوەڕکەن بە بزەی دەمی
یا بە گفتوگۆی قەندو شەککەری
ئەوەندە شۆخە گەر گوڵێ باخان
سەرنجی باتێ لە «ها» تا «سەری»
لە هەژمەت چاوی ئەگەوزێ لە خاك
دێتە ئاوزینگدان ، پەڕپەڕ ئەوەری
پەروانەش چرای گۆنای ببێنێ
خوڵ ئەداتەوە لەدەورو بەری
وەگەر لە شاخان شنەی بەیانی
لەپڕێکەوە هاتو تێپەڕی
بەسەر درەختی گوڵشەنی والای ،
بەسەر بەهەشتی دارو سێبەری
بۆنداره ، چونکە بە بۆی ئەگریجەی
ڕواوە ، بە بۆی پرچی عەنبەری
گلێنەی دیدەی تیشکی گەوهەره
گیانم بە ساقەی تیشکی گەوهەری
خامە ناتوانێ وێنەی بکێشێ
بەگشت ئەندێشەو کێشو لەنگەری[1]
کاتێ شەوقئەدا ئەڵێی ئەختەره
شەوق ئەداتەوە لەتەك ئەختەری

لائەدا شەوی گیانی تاریکم
وەك چۆن لائەدەم شەوی چەمبەری
برژانگەکانی وەك نیشتەر وانە
کێ خۆی ڕائەگرێ لەپێش نیشتەری ؟
بێجگە لەوانەی کەوا شاعیرن
پیشەیان بوویتە جوان پەروەری
گەلێ پەیکەری نایابم دیوە ،
بەلام ئەم دیوە وەکو پەیکەری
گەنجیو جوانی کڕنۆش بەرن بۆی
شەڕیانە لەسەر گوڵو شەستپەری
یەکێکیان دەستی لەسەر قامەیە ،
ئەویدیان دەستی لەسەر خەنجەری
ئەویتر ئەلێ : من دام هێناوە ،
ئەویشیان ئەلێ : منم دانەری
ج ئاوڕێکی بەرپا کردووە
بە شۆخو شەنگیقەدو کەمبەری ؟
گەردانە مەست بوو بەبوێنی مەمەی
کە ڕاکشا لەسەر سینەی مەڕمەڕی
وەك خوداوەندی پۆلی سەرمەستان
کاتێ مەست ئەبێ لەدەشتو دەری
بازبەندی لولوی وەك ماری گێسوی
ئالاوەتە ڕووی بازووی ئەسمەری
لەنەخشی بالای ئەدرەشێتەرە
تروسکەی ناخی گیانو جگەری
هەر خۆم ئەزانم چی جادووێکە ؟
چی وێنەیێکە وێنەی پەیکەری ؟

وەك شـۆخـە پـەری بـەهـەشتی خـوایـە
نـەخـێر شـۆخـتـرە لەشـۆخـە پـەری
زۆر کـەس بـەخیلیم پێ ئـەبـاو ئـەڵێ :ـ
کـاکـە لەحـەزا زۆر بـەخـتـەوەری
بـەڵام نـازانـی مـنـی خـێر نـەدیـو
لەرێـگـەی حـەزا دیـم چـەکـمـەسـەری
دوێـنێ بـوو دوێـنێ دڵم نـێـژت لە خـاك ،
دوێـنـێ بـوو دوێـنـێ گـوڵم هـەڵوەری
گـەر «وەلی» شـا بـێ لەنـێـو دڵداران ،
مـن شـای شـایـانم ، لێم بێ خـەبـەری

هەولێر : ١٩٦٠

---

(١) کێش و لەنگەر : وەزن و قافیە

# یادێك

بەبیرت دێ بەڵێنتدا ـ لەگوڵشەندا ـ بە دڵخوازیم
لەکوێما ئەو بەڵێنەی تۆ ؟ لەکوێما ؟ کوانێ شانازیم ؟
لەکوێما ئارەزووی پاکم ،
نیازی گیانی ڕووناکم ...
گوڵاڵەی باخی بۆندارم ، چرای ئاسۆی بەهادارم
لەکوێما ؟ کوانێ دیدارم ؟



بەبیرت دێ کە بۆ یەك بووین ، لەوێ ئەی دڵبەری شەنگم ؟
ئەتۆ گوڵ بووی ، منیش بولبول لەچیمەنزاری سەد ڕەنگم ؟
چریکاندم بە گۆرانی ،
بەلاژەی خۆشی سۆرانی :.
هەتا ماوم ئەمەکدارم .. ئەمن ، ئەی شۆخی نازدارم
لەکوێما ؟ کوانێ دیدارم ؟



بەبیرت دێ کە لەو کاتەی بچوك بووین دوور لەئاوایی
هەزار کۆشکم دروست کرد بۆت لەشێوەی کۆشکی زاوایی
لەبەردی ووردی نێو دۆڵان
لەخاشاکی چیاو چۆڵان ..
لەگیای سەوزو شەپۆلدارم چەرو چیلکەو گەلای دارم
لەکوێما ؟ کوانێ دیدارم ؟

بەبیرت دێ کەچەرداخم لەبۆت هەڵدا لە جۆخینا
بەرامبەر خۆری نێو ئاسۆ ، لەقرچەی گەرمی هاوینا ؟
بەلێنتدا بە دڵپاکی
ووتت : هەرتۆ ، ئەتۆتاکی
ئەوێستاکەش برینـدارم ئەمن ئەی یاری بێدارم
لەکوێما ؟ کوانێ دیدارم ؟



بەبیرت دێ کە ڕاوەستاین لەدامێنی چیای باڵا
کە با هات زوڵفی داوداوت لەشوشەی گەردنت ئاڵا
دیاربووی وەك پەری ووریا
وەکو وێنەی زەری زەریا
کە ڕۆیین گیانی دڵدرام چریکا چەشنی باڵدارم :ـ
لەکوێما ؟ کوانێ دیدارم ؟



کە تۆم دی چەشنی شاوڕژەن هەژاندم ناخی دڵداران
جوانکاری بووە پیشەم لە سەیرا نگاهی نازداران
لە بانیژەی گوڵەندامان
ڕواندم کامی ناکامان ...
لەکوێ ما ئەی شەبەقدارم وەفات ، هەر من وەفادارم
لەکوێما کوانێ دیدارم ؟
گەزافو لافی نازدارم ؟ !



هەولێر : ١٩٥٥

# لەسەر گۆڕی یار

لەسەر گۆڕت وەکو بولبول ئەناڵێنم هەتا ماوم
دوای ڕۆینی تۆ گێتی هەموو ڕەش بوو لەبەر چاوم
سەراپا کوڵخەنی ژیلەو زوخاڵە گیانی سووتاوم
هەموو فڕگەی خەم و ئێش و گرینە ژینی ڕووتاوم
دەبا وون بێ لەپاشی تۆ لەڕووی ئەم ژینەدا ناوم
لەبەر مەرگی سیاهی تۆ وەها سیس و پەشۆکاوم



وەکو ئەستێرەیێ گەش بووی لە ئاسمانی ژیانم تۆ
گوڵاوی کامی بێ غەش بووی لە باخی ژیانم تۆ
گزنگی خۆری گەردەش بووی لەتاق بەر بایانم تۆ
پڕیشکی ئاڵی ئاتەش بووی لە ئومێدی نیانم تۆ
فریشتەی شەنگی ئەندێشەم ، دڵارامی درەوشاوم
تەلاری پەیکەری باڵام ، پەرستگەی بەرزی ڕووخاوم



فەلەک چەرخت سەرنگوون بێ لەکەی ما شەو چراخی من
لەبەرچی هەوڵ ئەدەی ئاوا بە خەم پڕکەی دەماخی من ؟
لەلالان لالەیەکم بوو ئەو یشت برد لە باخی من
بڕۆ دەک تەفرو توونابی ، لەئاهی ئاخ و داخی من
لەمەولا ڕوو لەتۆ ناکەم هەتا لەم حاڵەدا ماوم
نە ئەتناسم ، نە ئەمناسی ، دە لاچۆ دەی لەبەر چاوم

گوناهی نەونەمامی من چی بوو لێرە ، لە گوڵزاران ؟
هەڵە یاخۆ زیانی ئەو چی بوو کوشتت بە ئازاران ؟
لەبەرچی ناوی ئەو دونیا نەدیوەت خستە سەر زاران ؟
برۆ با هەر لەئەستۆت بێ گوناهی پۆلی دڵزاران !
بەغەیری زەڕ چی سودێکت نی‌یە ئەی چەرخی بەدناوم
لەبەر کرداری ناپاکت وەها سەرسامو تاساوم



جوانی من جوانێ بوو ، بە دڵ وەك شەونمی گوڵ بوو
خەونگەی ویژەوانێ بوو کەویژەی مەشخەڵی دڵ بوو
لەشێوەی ئەرخەوانێ بوو ، هەمیشە شایەنی چڵ بوو
چ سوچێکی نەبوو ، نا ، نا ، سرووشی زەنگی بولبول بوو
ئیتر بۆچی لەپڕ هاتی بەرەو بەختی بریقاوم
ڕماندت کۆشکی ئاواتم ، وەراندت نێرگزی لاوم



کەچی ڕۆیی ، بەڵام هەردەم لە خەونی لالەزارانە
لە گولشەندا بەری شەنگی بنارو مێرخوزارانە
لەئاهەنگدا نەوای تارو سەدای دەنگی هوزارانە
لەدەربەندا گوزارێکی دیاری نێو گوزارانە
بەڵام من ئەی فەلەك هەردەم بە دەستی تۆلەنێو داوم
هیوادارم کە بێی بمبەی ـ لەپڕ ـ بۆ یاری نێژراوم



کە کۆچی کرد نیگاری من ، ئەمن بۆ کۆچ نەکەم کاکە ؟
لەبەرچی من بمێنم وا ، ئەویش بنـوێ لە ئەم خـاکە ؟
لەنێـو گۆڕێکی تـاریکـا ، کـەوا شـوێنێکی سـامنـاکـە
دەبـا بمرم منیش وەك ئـەو نـەمـانم ، مـردنم چـاکـە
لەئـەو ژینـەی کـەوا تـاڵە لەشێـوەی ئـەشکی ژاراوم
کـە ئەیـرێژم لەسـەر مەرگی ئـومێـدی پـاکی ژاکـاوم



لەتـەك ئـەو گـۆڕە بمنێـژن کـە دەورەی بێ درو داڵە
کـەبـەرگی خـۆڵەکـەی بـەردی سیـاەو قـاوەی‌و ئـاڵە
لەسـەر کێـل گـەراقـوپم کـە ڕەمـزی مـردنی تـاڵە
بنووسن ناوم‌و ناوی : «سەعادە»ی شەنگ‌و «پیربال» ـە
لە (زین) و (مەم) زیاتر بووین بەڵام ئەو چوو ئەمن ماوم
فەلەك تەختت سەرەنگون بێ ، بە دەستی تۆ بەشۆکاوم



هەولێر : ١٩٥٥

---

# گۆرانی‌یەکی تازە

یاران چەند خۆشە لەلای لەرەی چڵ
گوێی خۆم شل بکەم بۆ سکاڵای دڵ



چی ئاوازێکم داهێنا بۆ گوڵ
بولبول ڕاوی‌کاو بیدا بە سونبول



دایە پێی داوم دڵێکی ئەوتۆ
خۆی ببەخشێنێ بەمو بەوو تۆ



بەشێکی کرو ژیلەمۆو سۆیە
بەشێکی میسکو عەبیرو بۆیە



بەشێکی تەمو دووکەڵی گەرم
ئەویتر چەمو جەنگەڵی نەرم

بەشێکی گڵپەی گەرووی کوڵخەنە
ئەویتر نمی سەر رووی گوڵشەنە



چریکەم دوێنێ لای جوانکاران
وەك هەوێن وابوو ئەمڕۆ ساکاران



کاوێژی ئەکەن بە قیڕەقیڕیان
بەقیژەقیژو بە زیڕەزیڕیان



سەرەڕای ئەوەش ئەڵێن : سادەیە
خەریکی بەی‌و مەی‌و بادەیە



نە داهێنان‌و نە نوێخوازی
چی هەیە بەچی ئەکا شانازی ؟



دووزەڵەی بێ پیک چۆن ئەفیکێنێ ؟
چۆن هەستو نەستی خۆی ئەدرکێنێ ؟



یاران لەبەرچی وا تیر هاوێژن ؟
چاکە نەبێژو خەراپە بێژن



ئەمن چریکەم لافاوی داخە
جۆگەڵەی چاوی شامەلی باخە



هەڵئەقوڵێ[2] بە کوڵ لەچاوگەی ناخم
هەڵمەت ئەباتە ڕێژگەی دەماخم



تک ، تک دێتە خوار لەشێوەی ئاونگ
کز وەکو کەسەر ، سز وەکو گزنگ



گۆزەم پڕکرا لەژاراوی تاڵ
پەڕم دەرهێنرا ئەما پەڕو باڵ

بێ بەشیان کردم لەئارەزووی چاک
لەزەردەخەنەی نیازی ڕووناک



دوورخرامەوە لە ڕۆشنبیری
لە زەردەپەڕی زرینگی‌و ژیری



سەرەڕای ئەوەش جوانەمەرگم
کە ڕۆیی تیری چەقاندە جەرگم



تەنیا جێی هێشتم لە گێژەنگی خەم
لەسەر دەربەندی پڕ لە مژو تەم



ئینجاکە ووتیان هەڵسە بخوێنە
وەی چۆن بخوێنم ، دڵم بە خوێنە



باڵندەیەکی شاپەڕ شکاوم
لە دەشتێکی چۆڵ پێوەند کراوم

چواردەورم پڕ لە درندەو داڵە
بۆیە چریکەم بە ناڵە ناڵە



کەچی دوێنێکە وەکو زەنگ وا بوو
بۆ برینی گەل پێچو دەوا بوو



بەڵام ئەمڕۆکە وەك شەپۆڕ وایە
وەك گڕی کورەی دۆزەخی خوایە



جاربەجار وەکو پەیام هەڵگران
هێرش ئەبەمە سەر ڕەخنەگران



ئەڵێم : بەرمەدەن چاوم هەڵێنم
ڕێگەم والاکەن تابچریکێنم



ئەوسا ئەزانن مەلێکی چۆنم ؟
نوێمە یانە وەك ئەڵێن کۆنم ؟

نەغمەخوانەکەی ڕۆژێکی گەشم
یا قەلەڕەشکەی شەوێکی ڕەشم ؟



ڕەشەبای گەرمی دەشتی باشوورم
یاشنەی نەرمی گەشتی باکوورم



چنەم بۆچی‌یە لە قەفەزی تەنگ ؟
سێیەرم ناوی بێ‌هەتاوی شەنگ !



شاپەرم مەبڕن بەبێ تاوانم
بەهرەمەندێکی زمانەوانم



ڕەوان بێژێکی خاوەن وێنەمە
بۆ جوانکاری وەك ئاوێنەمە



ئەوەی کە ئەیڵێم بۆتان قازانجە
تروسکەی هیواو تیشکی ئامانجە

ئەڵێم : کەوێکی زێڕو پسپۆڕم
ئەقاسپێنم بۆ گزنگی خۆرم



تاکوو ڕووناک کا ئاسۆی هەوارم
لابدا شەوی تاریکو تارم



گوڵێکی ئاڵە گوڵی ئازادی
ئەوەی بیگاتێ ئەگاتە شادی



ئەوەی ئەو گوڵەی نەبێ لە ژیان
مایەی ژیانی ئەبێتە زیان



کە قسەی ئاوا ئەکەم بەهەستم
گومڕایی ناکەم ، تاکو بوەستم



گەر گومڕایی یە وازی لێ بێنم
زارم بگرم و چاوم دەرێنم



دووربم لە دونیای گۆرانی دانان
نەزان بم لەگەڵ پۆلی نەزانان



باخ پاسەوانی گەلۆڕو خاو بێ
هەر ئەبێ مەلی لە فاق و داوبێ



هەولێر : ١٩٥٨

# گەوهەری تاجی شا

لەڕووی تاجی شایەکی زاڵ
چەسپابوو گەوهەرێکی ئاڵ
ئەدرەوشایەوە وەك پەڕەنگ
وەك گوڵ ئەستێرەی ڕەنگاو ڕەنگ
وەك مانگی پڕ بە ئەمو ئەو
خەرمانەی ئەبەخشی بە شەو
ئەوەندە گەش و ڕووناك بوو
ڕووگەی هەر دڵێکی چاك بوو
چوومە بەر دیمەنی تاکی
پرسیم لەترووسکەی پاکی :
ئاخۆ گۆنای کام پەری بووی ؟
لێوی ئاڵی کام زەری بووی ؟
ئاوا بووی بە ئەم چرایە
لە تاجی سەری ئەم شایە ؟
خۆزگەم بە گیانت چەند گەشی ؟
لەشێوەی گڕی ئاتەشی ؟
وەك نیگاری نەوجەوانێ
وەك چەپکی دەست باخەوانێ
وەك پەلکەزێڕینەی چەماو
بەرامبەر ئاوێنەی هەتاو

دڵ ئەڕفێنی بە خەندەی دەم
لەم شوێنە بەرزەی بەر دیدەم !
ئەم قسانەی بیست لە زارم
سەری سوڕ ما لە پرسیارم
ووتی : وەك چۆن ئەڵێی وانیم
ڕاوەستە بڕوانە من چیم ؟
گەر نەڕوانی‌یە ڕەسەنم
نازانی من بایی چەنم
نازانی بۆ بزەم شەنگە
بۆ دیمەنم ڕەنگاو ڕەنگە
بۆ نیم نیگام دڵ ڕفێنە
ڕووخسارم لەشکر شکێنە
کە زانیت ئەوسا بە وێنەم
هەڵبڵێ، یا بە ناوێنەم !
ئەوسا نەخشی جوانکاریت
بنوێنە ، یاخۆ شاکاریت
ئەوسا خۆزگە بە گیانم کە ،
بە تروسکەی نیانم کە
کەچی پەیکەرم ڕووناکە
دڵ ڕفێنەرێکی چاکە
بەلام من خۆم چاك ناسیوە
بنەڕەتی خۆم چاك دیوە
دەبا پێت بڵێم ئەمن چیم ؟
ئاتەشم یانە زیخ و لیم ؟
ئەمن ئارەقەی ڕەنجدەرم
ووزەی مرۆی قەلەندەرم

ئاخو داخی هەتیوانم .
ئاواتی پشت چەمیوانم
مانگەهای مانگ ، سالەهای ساڵ
مایمەوە لە کانگەیی قاڵ
بربڕە ، وا بە نهێنی ،
بە پەنهانیو چاو قوچێنی
بووم بە ئەم بەردە ڕووناکە
لەڕووی تاجی ئەم ناپاکە
ئەوانەی لە دەور و پشتم
چەقاون ، یا لەتەنیشتم
هەموو ئەم دوڕو مۆرییە
خوێنی بێکەسو بەرییە
سیوو جگەری بڵاوە
بەئەم تۆپەڵە ئاڵاوە
بەری داری بێ دادییە
مەلولیو ناگوشادییە
ڕەنجی ئیشکەرو پاڵەیە
زامو گریانو ناڵەیە
شەوقی چاوی کەساسانە
گەردی گۆنای تۆلاسانە
حەسرەتی گەنجێکی لاتە
کەنانو شیوی لاقاتە
ئەمەیە ویژدانی شاهان
گوناهی خاوەن گوناهان
مژینی دەمارو ڕەگان
بۆ مەزەو شەڕابی بەگان

بۆ لاف ڕووی لاف لێدەران
لەسەر کەللەی دەربەدەران !
جا بنووسە خامەی دەستم
لەدووا لەنگەری هەڵبەستم
بڵێ بەوەی کە مردووە
لای وایە هێشتا زیندووە :
ڕۆژێ دێ گەڵ بە سەربەستی
ملت بخاتە ژێر دەستی ...
تاجت بهاڕێنێ بە گوێ
بۆ خوێ بەرێ گەوهەری خوێ

هەولێر : ١٩٥٤

---

# شامەڵ[1]

دەمێ بوو شامەڵی شەیدا لەچیمەنزاری ژاکاوی
کڕو کپ ، بێ چریکە ڕووی ئەکردە کێوی سوتاوی
شەوی تاری لەنێو چاوی وەکو ئەفسانە وەستابوو
نەبوو یەك تۆزە ڕووناکی کە ڕووناکی بکا چاوی
بە کێ دڵخۆش بکا ؛ ڕەنگی ، کەیفگەی بەزمو ئاهەنگی
نەمابوو تا بزەی شەنگی بگاتە زامی پێچراوی
لەناکاو خۆری ئاسایش لەئاسۆ هاتە فریادی
بەئاستەم تیشکی پیرۆزی گەیاندە چاوی بێتاوی
چریکە سەرلەنوێ بلقا لەچاوەی ڕۆشەنو ڕوونی
ڕژایە گوێی هونەرمەندان بە چرپەی تازە ڕازاوی
لەسایەی تیشکی ئەم خۆرە قەلیش کەوتە چریکاندن
چی جادووی لایە نازانم ، چیە تیشکی درەوشاوی ؟
هەتا پووشی چیاو چۆڵان کەڕاوە نێو بەهاری نەو ،
گەڵای داری خەزان گۆڕی بە هی نوو بەرگی تۆزاوی
لەسەر لوتکەی «سەفین»ی شەنگ ؛ بەرامبەر تۆپەڵی «هەولێر»
لەهێلانەی سیامەندی لەدەم ڕووبارو ڕێژاوی
پەڕو باڵی خوراند تۆزی لەجەستەی داوەشاند شامەڵ
بە ووردی ڕوانیە شێوەی بەڕەنگی سوور بریقاوی
لەباکوورا بەرەو باشوور فڕی دەردەنگی ڕامالی
کە زانی کۆنگرە بەستن هەیە بۆ چینی خولقاوی
زەوی‌و زاری بڕی تاکو گەیشتە بارەگای «بەغدا»
لەفڕگەی دابەزی تاکو حەساوە پەیکەری خاوی

ئەوا ئێستا لەسەر شانۆ بەرامبەر ئێوە وەستاوە
وەکو چۆن زۆر کەڕەت وەستا لەسەر شانۆی بەجێ ماوی
ئەویش وەك ئێوە دلسۆزە ، بەرامەی پاك و پیرۆزە ،
ئەویش بۆ میللەت و هۆزە پەژارەی گیانی ڕووخاوی
لەڕووی ڕەنگی وەفاداران ، لەقوڕگی زەنگی باڵداران ،
لەپێلوی زامی دلداران دیارە ، ئەشکی خوێناوی
سڵاوی شاری ئەژدادی ، پەیامی لاوی ئازادی
ئەداتە کۆنگرەی شادی گوڵاوی شیعری نووسراوی
دەسا گوێ ڕاگرن ئەختێ لە دەردەنگ و لەمۆزیقای
لەئاوازو نەی و سازی ، لەهەڵبەستی زرینگاوی
ئەڵێ : ئەی پۆلی دلداران ؛ هۆزارانی گوڵستانم
فڕندان وا شەبەق دەرچوو ، لەئاسۆ پەرت بوو شاڵاوی
بەخۆم بینیم کەچەن لالە درەوشاوە لە کۆسارم
لە کاتێکا کە تیشکی خۆر گەیشتە داری ڕووتاوی
دەخێرا ڕووکەنە ڕووگەی پەرستخانەی هونەرمەندان
دە خێرا دەی بنەخشێنن لەوێ میحرابی چەسپاوی
لەهاوینا بەگەرمایێ ، لەزستانا بەسەرمایێ
لەپایزدا کە گوڵ ڕۆیی ، چەمەن گریا لەبۆ ئاوی
ئەگەر سەرباز بەرەو ئاگر بهاوێ پێ ی لەمەیدانا ،
ئەبێ شاعیر لەئەو چاتر بهاوێ پێ و هەنگاوی
ئەبێ پێتی لەئاگر بێ ، ووشەی بورکان و پەنگربێ
ئەبێ ئیمان و باوەڕ بێ بەخۆی و شۆڕشی لاوی
ئەبێ کاتێ ئەدرکێنێ ، بەئازادی بدرکێنێ
بڵێم بۆمن ئەدرکێنێ ئەوەك بۆ ئارەزوو ناوی
ئەبێ هێزێ لەدونیادا بەدووری خا لەئامانجی
ئەبێ تێنێ لەخشتەی با بە فرت و فێلی ژەنگاوی

لەهەر لا چین بە چین بێنە تەماشای کۆشکی ئایینی
لەوێ شاگردی ئاین بن بەرەو ڕووی کۆشکی هەڵساوی
بگێڕن پەنجەیان یەك یەك لەسەر مێرگو گیای شەنگی
ببەستن چەپکی بێ ژەنگی لەگوڵزاری نەگەچڵاوی
ئەگینا تارەکەی دەستی بداتە دەست جوانکارێ
هەتاکو بۆی بەجێ بێنێ هەموو ئاواتی ڕووخاوی
ئەوەندەی پێکرا شامەل بخوێنێ ئەمڕۆ بۆ لاوان
هیوادارە تەواوی کا سبەی بۆ هۆزی ناساراوی

---

(١) لەکۆنگرەی یەکەمی یەکیەتی نووسەرانی کورد پێشکەش کراوە .

## نامەی ئاوەرەیەك[1]

شەوێ لەشەوان کە دەرچووم لە ماڵ
ناسیاوێکم دی چاوتێرو خۆش حاڵ
لەدوای گفتو گۆ لەگەڵ یەکتری ،
لێ پێچینەوەو پرسینی هەواڵ
پێی ووتم : فەرموو - ووتم : بەرەو کوێ ؟
ووتی : ئاهەنگی جەژنی سەری ساڵ
گەییم بە ئاهەنگ بەسەری تاساو ،
بە دڵی پڕ لەژیلەمۆو زووخاڵ
لەوێ دانیشتم بەرامبەر مێزێ
لەقوژبنێکدا بە هەستو خەیاڵ
لەنگەری پڕ لە نوقڵی ڕەنگاو ڕەنگ ،
پڕ لەچەرەسی زەردو سپی‌و ئاڵ
پەردەی ئاوریشمین لەتەك پەنجەرە
ئەجولایەوە بەشنەی شەماڵ
جارجار پەیکی «با» ئەیخستە لووتم
بۆنی وەنەوش‌و نێرگزی تاڵ ، تاڵ
مانگ وەکو وێنەی ڕووخساری پەری
ئەدرەوشایەوە لەسەر کێوو یاڵ
ئەستێرە بزەی گەش‌و ڕووناکی
ئەرێشتە چاوان بە چاوی کەژاڵ
لێرە ئینجانەی مێخەك‌و شەوبۆ ،
لەوێ ڕەیحانەی بۆنداروو خاڵ ، خاڵ
لەدەورو پشتی گوڵدانی قەشەنگ
پەپولە هەنگی ڕاو ئەنا بە باڵ

لێرە «نەی» لەوێ «جازو» و «پیانۆ»[٢]

لێرە «مەی» لەوێ «بەی» و «پرتەقاڵ»

لێرە ئافرەت و لاوی خوێن شیرین

لەوێ ئافرەت و کچی نەو نیهاڵ

شەقەی پێڵاوو تەپەی سەماکەر

دەنگیان ئەداوە لەچوارگۆشەی ماڵ

دەمێ «ڤالس» دەمێ نەخشی «کەلەکێت»

دەمێ «دانس» دەمێ ئاوازی «کۆڕاڵ»

هەرلاوێ بەجێ هێنانی سەمای

هونەروەرێ بوو ، لە هونەرا قاڵ

لەکاتێ کە یاد لەمێشکی کەللەم

ئەجولاوە وەك ژووژك و قرژاڵ

لەکاتێکا هەست لەڕەگی جەستەم

گاگۆڵەی ئەکرد هەر وەکو منال

ئا ، لەو کاتەدا ، لەپڕێکەوە

چاوم هەڵێنا بەرەو جێی بەتاڵ

دڵبەرێکم دی لەشێوەی خەیاڵ ،

لەشێوەی پەریی ئاسمانی ساماڵ

لەهەردوو گۆنای تریفەی چرا

ئەبریقایەوە ، تیشکی ئاڵ و واڵ

نزیك کەوتەوە لێم بە ئاسپایی

بە لێوی ئاڵ و بە نیگاهی کاڵ

نەختێ ڕاوەستا ، پاشان بەچوستی

جێی خۆی کردەوە لەکورسی بنپاڵ

دەمی کردەوە ئەستێرە توقی ،

لەحەیفان خونچە خۆی نێژت لەنێو چاڵ

وەی ! ئـەمـە چـی‌یـە ؟ چی دیـمـەنێکـە ؟
چی پـەنجـەیـەکـە ؟ چی نـاز ؟ چی دەلال ؟
چـی نـوشـتـەیـەکـی گـیـان‌و دڵانـە ؟
چـی ڕازێـکـە ؟ چـی تـەلیـسـمـێـکـە زاڵ ؟
وتـی : ئـاوارەی ؟ وتـم : ئـا ، بـەڵێ
ئـاوارەم بـە دەسـت کـونـدەبـۆو سیـسـاڵ
ئـاوارەم لە خـاك ، لەووڵاتـی خـۆم ،
ئـاوارەم لە داك لە مـام‌و لە خـاڵ
بـۆیـە ئـەمـبـیـنـی بـە تـاق‌و تـەنـیـا ،
بـەبـێ هـاودەم‌و هـۆگـرو هـەڤـاڵ
سـیـسـاڵ لەدەنـگـی زەنـگـی نـایـابـم
کـۆڵدارە هـەرواش گـوجـیـلەو کـەمـاڵ
چـونـکـە مـەڵێکـی خـاوەن هـەڵوێـسـتـم
چـونـکـە ئـەخـوێـنـم بـێ درۆو فـیـشـاڵ
ئـاوازی خـۆشـم لە گـوێی بـاڵنـدان
دەنـگ ئـەداتـەوە وەك دەنـگـی شـمـشـاڵ
وتـی : پـێـکـەنـە ، وتـم : نـاتـوانـم
وتـی : لەبـەرچـی ؟ وتـم : خـەمـی تـاڵ !
وتـی : خـەمـی تـۆ ئـەوەنـدە تـاڵە ؟
وتـم : تـاڵتـرە لەژاراوی ژاڵ
وتـی : بـنـۆشـە بـەبـۆنـەی شـادی
بـەبـۆنـەی مـن‌و جـەژنـی «کـەرنـەڤـاڵ»
لەبـیـرکـە خـەم‌و تـەم‌و نـاڵەنـاڵ
چـیـتـە لەخـەم‌و تـەم‌و نـاڵەنـاڵ ؟
وتـم : ئـەم مـەیـە خـەم نـاڕەوێـنـێ
بـیـرێـژەوە نـاو قـاپـی کـریـسـتـاڵ

ووتـی : کـەواتـەخـرپـەی دڵی تـۆ
لێئـەدا هـەردەم بـۆ کـێـوی جـەنـجـاڵ
بـۆ بـەفـری سپی و لوتکـەی گـەردن گـەش ،
بـۆ تـاڤـگـەی «گـەلی» و ڕێـژاوی «بێـخـاڵ»
بـۆ چـاوگـەی وەکـو ئـاوێـنـەی ڕۆنـدار ،
بـۆ ڕێـژگـەی سـاردو جـۆگـەڵەی زوڵاڵ
بـۆ کـۆچـەران و ڕەشـمـاڵی سـەرڕێ
چـیـت دیـوە ئـاخـۆ لە ڕێـگـاو ڕەشـمـاڵ ؟
ووتـم : ئـەدی چـۆن بـۆ نـیـشـتـمـانـم
بـۆ زەوی و زاری پـڕ لە کـشـتـوکـاڵ
پـڕ لەهـەیـاسـەو پـاشـەسـەری زێـڕ ،
پـڕ لەگـەردانـەو گـوارەو خـرخـاڵ
پـڕ لەچـارۆگـەو تـارای زەردو سـوور
پـڕ لە سـەرپـۆش و پـووبـەنـدو دەسـمـاڵ
ووتـی : کـەواتـە هـیـچ لەبـیر نـاکـەی
ووڵاتـت هـەتـا بـە سـامـان و مـاڵ
ووتـم : مـاڵ ئـەڕوا نـاوبـانـگـی خـاوێـن
ئـەمـیـنـێـتـەوە ، نـایـدەم بـە ڕیـاڵ
ووڵاتـم ئـەوەی بـەهـەشـتـی ژیـنـە
ئـەیپـەرسـتـم وەك بـتـپـەرسـتـی لاڵ

**هەولێر : ١٩٥٦**

---

(١) نامەی برادەرێکی ئاوارە بوو
بە دەستکاری یەوە کردوومەتە کوردی .
(٢) جازو پیانۆ : دوو چەشنە مۆسیقای ڕۆژئاواین .

# کەژاوەی بەهار

لەچیمەنزاری گوڵزاری بەهاری شاری ناودارم
ئەوەستم وەك نیگارکێشێ لەعاست نەورۆزو ئادارم
ئەگێڕم چاوی ئەندێشەم لەتابلۆی نەخشی سەد ڕەنگم
ئەبینم خۆری ئاسایش بلێسەی دێتە ئاهەنگم
لەبەندەندا دیارە هەروەکو بووکە زەری وایە
چ شۆخێکی دڵارامە ؟ وەکو شۆخە پەری خوایە
سەرنجی وورد ئەدەم ئاسۆ لەهەر لا هێمن و زاڵە
سەرانسەر پڕ لە باڵندەی سیاەو قاوەیی و ئاڵە
ئەبینم کۆتری شەیدا بە چەپڵەی شاپەڕو باڵی
بە تەقڵەی یەك دوا یەکی ئەلاوێنێ گوڵی ئاڵی
نیشانەی ماف پەرستان و دروشمی ئاشتی خوازانە
ئەمن واتێ ئەگەم وایە ، پەیام نێری نیازانە
سەرنجی وورد ئەدەم دەورەم لەهەرلا پڕ زەماوەندە
سەراپا پڕ لەئاوازە ، پەیاپا پڕ لە گۆڤەندە !
بەرەوڕوم هێڵێ کێشاوە ، کروکپ پەلکەڕەنگینە
دەسەیری نێوچەوانی کە ، بزانە چەندە سەنگینە
وەکو تارای خوداوەندی جوانی ئاڵ و والایە
بەشێوەی پەیکەری کۆکان قەشەنگ و بەرزو بالایە
وەکو تاقی قەراڵیچەی دڵان بەم چەشنە هەستاوە
بەرامبەر پەنجەرەی گەردوون لەسەر ئەم عەردە وەستاوە
ئەوەندە کاری کردوتە خەیاڵم ڕەنگی بێ ژەنگی
لەباتی ڕیشە پێنووسم ئەکێشێ دیمەنی شەنگی
ئەویش وەك مەشخەڵی نەورۆز لەئاسۆدا جەڤەنگێکە
ئەویش بۆ میللەتی پیرۆز وەکو گڵپەی پەڕەنگێکە[1]

لەژێـــری‌دا مـــەلی شـــادی بـــە شـــانـــازی ئـــەچـــرکێنـــێ
بـــەدەنگی زەنگی ئـــازادی هـــەمـــوو ڕازی ئـــەدرکـــێنـــێ
لەگـــەڵ پۆلی گـــوڵەنداممـــان لە بـــەزمو ڕەزمو گـــەشت دایـــە
لەگـــەڵ چینی دڵارامـــان لەنێـــرگسجـــارو دەشـــت دایـــە
تـــەماشـــای کێ ئەکـــەم هەر چی‌ئـــەبیئم‌هەر وەهـــا شەنگـــە
ئـــەگەر جێـــژەنگە یـــا ڕەنگە ئـــەگـــەر ئـــاوەنگـــە یـــا پـــەنگـــە
کەیفگەی سەوزی مەی‌نۆشان ئەوەندە مەستو پڕ جـۆشە
ئـــەوەی نەی دیبێ نـــازانی چ مەڵبـــەنـــدێکی ڕوو خـــۆشـــە
لەژێـــر فەرمـــانی (باخـــۆس)ی گەواهی مـــەی گـــوســـارانـــە
لەســـای لوتکـــەی جـــوانی‌دا ســـەرنـــج ڕاکێشی یـــارانـــە
هەوارگەی کام ڕەسەن حـــۆری ، تەلاری کـــام نیگارێکـــە ؟
چ بێشـــە ، یـــا چ قـــالیچـــە ، چ نـــەخشی کـــردگـــارێکـــە ؟
ئـــەبینم پڕ بـــە دوو چاووم تـــروسکەی خـــۆری هەڵهـــاتووم
دیـــارە هـــەروەکـــو ڕەنـــگی گـــزنـــگی ڕۆژی داهـــاتـــووم
کە شەو دێ مانگی پڕشنگدار لەسەر ڕووی ئاو وەکو جـامە
بڵێســـەی کوڵی ئـــەستێـــران لەشێـــوەی بـــووکی ئیلهـــامـــە

درەختی سەر شەتاو سەف سەف خەونگەی خۆشەویستانە
نـــەهۆمی هـــەر وەکـــو ژووری پـــەری٘جـــوانی پـــەرستـــانـــە
ئـــەوەی من پـــڕ بـــە دوو دیـــدەم ئـــەبینم هـــەر سپی‌و ئـــاڵە
ژیـــانێکی گـــەلێ خـــۆشـــە نـــەوەك هـــەنـــدێ ئـــەڵێن : تـــاڵە
لەبـــەرەوەی هێنـــدە خـــاوێنم دڵم شـــەوبـــۆی بـــەهـــارانـــە
چـــریکەم نـــوێتەیـــە ، هـــەستم نـــەوای ســـەمتـــورو تـــارانـــە
ئەگەرچی جار بەجار تێژم لەعاست «دەحاك» و «نەمرود»م
بـــەلام ئـــاواش لەگـــوێی لاوان وەکـــو شمشـــاڵی داودم !
کـــەمەنجـــەی دەستی گۆینـــدان لەتاســـەی زەنگی بـــاڵدارم
چـــەقیـــوە هـــەروەکـــو نـــاخی پـــەڕنـــدەی بـــاخی بـــۆنـــدراوم

ژەنەی نەی ژەن لەئاهەنگان سروودی دڵنیایی مە
هەموو دەنگێ لە دەردەنگان درووودی میدیایی مە
شەریتی هەستو ئەندێشە لە یەکەم ڕۆژی دونیادا
بە ڕووی ئەم گیانە ئالاوە وەکو یاقوت لە دەریادا
نی یە سازێ وەکو سازم دەریخا سۆزو ئاوازی
نی یە ڕازێ وەکو ڕازم بدرکێنێ بە شێوازی !
تەماشای کونجی گیانم کە ، نی یە بێجگە پەرستگایێ
وەکو بتخانە هەستاوە لەوێ ، هەر وەك نوێژگایێ
کەژاوەی خاتوو «عەشتار»و توێڵکی خوشکە «ڤینۆس»ە
سەرو چاوەی خەیاڵی خەست ، هەوێن خانەی هەوێن لێسە
سەماگای شەنگە «ئیلات»و نەخشگای مەنگە «سافۆیە»
پەناگای هەستیارانو هونەرخانەی (ئەپۆلۆ)یە
هەزار تەقسیمو سەد پێكو هەزار (هارمۆنی) تێدایە
لەسەر شانۆی هونەرمەندان هەزار (سیمفۆنی) لێدایە

لەگەڵ دەرچوونی خۆری حەز لەئاسمانی درەوشاوان
پیشانگایەکە بۆ لاوان ، لەوەرگایەکە بۆ چاوان
لەدەورەی پۆلێ دلداران هەموو سەرخۆشو سەرسامن
لەگەڵ تیپی بریندارانی خەریکی زایەڵەو جامن
بەهاران چین بە چین دێنە تەماشای کۆشکی ئاینی
لەوێ توتکەو فەرامۆشن بەرامبەر لانکی زایینی
لەهاوینا بە گەرمایێ ، لەزستانا بە سەرمایێ
لەپایزدا کە گوڵ ڕۆیی ، چەمەن گریا لەهەر لایێ
هەموو دێنە پەنای داری ، پەنای گوڵزاری نازداری
پەنای باڵداری شاکاری ، هەواری پاكو بۆنداری
ئەگێڕن پەنجەیان یەك یەك لەسەر مێرگی درەوشاووم
ئەبەستن چەپکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبیستانجاڕی نەخشاووم

ئەنێرن بۆ خوداوەندی جوانی مێخەك و شەوبۆم
ئەڵێن پادەشتی گەنجانە بەرامەی نێرگزو هێرۆم
ئەڵێن مژدەی جوانانە گوڵاڵەی ئاڵی ئینجانەم
هەناسەی بێ زیانانە هەناسەی شەستپەڕی یانەم
تریسکەم ئارەقە بۆیان ، وەکو ئاوی ژیان وایە
ئەوەی تامی بکا جاری پەرۆشی ئارەقی خوایە
ڕەوشتی ناخی نایابم لەنێوی‌دا نیهادێکە
نی‌یە هاوتای لەپاکی‌دا نیهادی ڕوو گوشادێکە

لەزێری ڕۆژو ئەستێرەم ، لەزیوی مانگی ڕووناکم
لەئەم نرخانە خوڵقاوە هەناوی پاکژو پاکم
لەمەولا ڕوو لەخەم ناکەم بەرەو ئامانجی پیرۆزم
ئەنێم هەنگاوی گورجانە لەڕێگەی میللەت و هۆزم
بەرەو دەربەندی ئاواتی وولاتم زۆر بە چالاکی
ئەڕۆم تاکو لەئەنجاما ئەبینم ڕەنگ وڕووی تاکی
سەراسەر پاکی ڕازاوە بەخەرمانەی گوڵەندامی
بەڕەیحانەی مەی‌و جامی بە پەروانەی دلارامی

وەنەوشی مۆر لەگەڵ بولبول ئەژی هەر وەك مەم‌و زینم
لەسەر یەك هێلو یەك بڕوا وەکو فەرهادو شیرینم
بەپوولان قەف بەقەف دێنە بەزمگەی نێرگزولاڵە
ئەوەی زەردی ئەوێ زەردە ئەوەی ئاڵی ئەوی ئاڵە

لەئاین هەلبژاردن‌دا هەموو سەربەست‌و ئازادن
لەسای ئومێدو هیوایان هەموو بێ‌گەردو دڵشادن
لەمەولا ڕوو لەخەم ناکەم ئەڵێم : ئەی خەم بڕۆ لادە
ئەمن بۆیە ئەژیم تاکو ببینم هەر دڵێ شادە

لە بەندەنـدا لەگەڵ دەســـتەم نەمـــامی شـــادی ئەڕوێنـــم
لەگوڵشەندا لەگەڵ بەستەم گوڵی ئـــازادی ئـــەدوێنــــم

نی‌یـــەهێزێ لـــە دونیـــادا بەدوورم خـا لە ئـــامـــانجـم
نی‌یە تینـــێ کەڕاپێچـــی بکا خەرمـــانـــی قازانجــــم

لەگەڵ دەرچـــوونی خۆری جەژنـــی ئـــاواتم لەســـەر شاخان
بەتەقەی پێ‌و شەقەی چەپڵەو پەنجەم لەنێـــو بـــاخـــان

ئەگێـــرم جۆیێ شـــەنگـــر لەچۆیـــی ڕۆژی زاوایــــم
نەبێ وێنـــەی لەئـــاهەنگی گرنگـــی دێو ئاوایـــــم

نەبـــی وێنـــەی لەشەنگی‌دا ، لەبـــەزمو ڕەزمی گەنجـــی‌دا
نەبێ کەس خـــۆی لەڕەنگی‌دا ، لەبـــازاڕی تەونجـــی‌دا

ئەگەرچی شەستـبەڕی تافی جوانی مـن ســـێرا خـــاك
بەڵام ئێســـتا لەگوڵزارم ئەڵێمـــە گـــوڵ ڕنـــەرهۆکـــاك

ئـــەمـن هەردەم بـــە دڵپاکـــی ئـــەژیم لێـــرە لە ڕووناکی
ئەگەر پێت خۆشـــە خەمناکـــــی ، دەبا بۆتۆبـــێ خەمناکی

---

(١) پەڕەنگ : پشکۆ .

(٢) عشتار : خوداوەندی خۆشەویستی‌و جوانی‌یە لەلای گەلەکانی (ساقـۆ) بەرامبەر بە (انینا)یە بەلای سۆمەری‌یەکانەوە .

(٣) باخۆس : خوداوەندی مەی‌نۆشانە بەلای یۆنانەکانەوە .

(٤) ئەپۆلۆ : خوداوەندی شیعری یۆنانی‌یەکانە .

**بەرهەمە چاپکراوەکانی شاعیر بەزمانی کوردی :ـ**

ـ بەهەشتی دڵداری (شیعر) کرکوك / چاپخانەی الشمال ـ **١٩٥٧** •

ـ لافاو (شیعر) کرکوك / چاپخانەی الشمال ـ **١٩٥٧** •



بەرهەمە چاپکراوەکانی بەزمانی عەرەبی :ـ

ـ من الماضي (شیعر) / چاپخانەی الشمال ـ **١٩٥٨** •

ـ شبابة الالم (شیعر) موسل / چاپخانەی موسل ـ **١٩٥٨** •

ـ همسة العشاق (شیعر) بەغدا / چاپخانەی سعد ـ **١٩٦٨** •

